ناوی کتێب: مەملەکەتی ئەوین

نووسینی: عادل محمد شێخانی

دیزاین: گۆڤاری بڕیار

تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

نۆبەی چاپ: یەکەم

ساڵی چاپ: ٢٠١٥

لە بەڕێوەبەرایەتی گشـــتی کتێبخانە گشـــتیەکان، ژمارەی سپاردنی (١٢٥٢)ی ساڵی ٢٠١٥ی پێدراوە

## مەملەکەتی ئەوین

جیهانێکە لە **گوڵ**.......

دەریایەکە لە گوڵاو، بەهەشتێکە لە **ئەوین**....

باوەشێکە لە **سۆز**....

دەڤەرێکە بۆ پەپوولەو نیشتمانێکە بۆ **دڵە سپییەکان!**

قوتابخانەیەکە بۆ گەیشتن بە عیشقی حەقیقی و **ئەوینی ڕاستەقینە!**

شەهدی شیعری جوانو **هەستی پاکە**.....

وانەی سووتانو هەڵقرچانو ناڵەو **تاسەیە!**

بۆن و عەبیری **ڕاستگۆییە!**

چرپەی ژووانی ڕۆح و **دیداری عومرە!**

ئاشنابوونە بە مرۆڤ و **ئاوێزانبوونە بە ڕۆح!**

گەڕانەوەیە بۆ فیترەتی پاکو هەڵمژینی شنەی بەهەشت

و هاودەمی مرۆڤە بەهەشتییەکان!

تێکەڵبوونە بەو هەســـتە پاکو بێگەردو ڕاستەی، کانیاوی شیعرەکانی

نالیو مەحویو ســالمو کوردیو هەموو شــاعیران و ســرودو درودی

ئەوینی ڕاستەقینە بوون!

**مەملەکەتێکە بۆ دۆزینەوەی خود، بۆ بینینی هەموو جوانییەکان،**

**بۆ ئۆخژنی دڵ و ڕاحەتی ڕۆح!**



# نەکەی بڕۆی

ژووانی شــەمو پەروانە، چ کەم خایەن‌و کورتە
ئەو کاتێ لە خــەو ڕادەبێ، ئیدی ئەمەســوتێ!

(کوردۆ)

تۆ ئیتر بەرامبەر بە فرمێسکەکانی من بەرپرسیاری، چونکە من ئیتر ئاوێزانی ئەوینێکم ناتوانم چرکەیەك بێ ئەو بژیم!!

ئیتـــر بوخچەی هەموو خۆزگەو ئاواتەکانم داوەتە دەســـتت، مـــن مانـــدووی ڕێگایەکی دوورم، چەندین ســـاڵە بە دووی تۆدا وێڵبووم!

هێندەم چـــاوەڕوان کردی، خەریکبوو وەکو نێرگزەکەی نالی سۆمای چاوم سپی بێت!

هێنـــد مونتەزیـــری بـــوو، هەتا چاوی ســـپی بوو
نێرگز کە لەســـەر یەك قـــەدەمو دیدە چەقی بوو!

ئەوەی من دەیبینم، هەموو کەس نایبینێت، ئاســـاییە ئەگەر بە شێتم بزانن، لە وشەکانم تێنەگەن!

من بە شوێن سیمای مرۆڤەکاندا ناگەڕێم، شەیدای ڕووکەشەکان نیم، بە تەنیا ڕووخسارە جوانەکان سەرنجم ڕاناکێشن!!

مـــن لـــەو ڕۆژەوە دەگەڕێم کـــە لە مانای مرۆڤ گەیشـــتوم، ســـەیرە، خەڵکینە، خۆ هەموو مرۆڤەکان لە گڵ دروســـتکراون، بـــەڵام ئەو گڵەی من بۆنـــم کردبوو چەند بـــۆی دەگەڕام، پێی نەدەگەیشتم!!

بـــەڵام من کۆڵم نەدا، بڕوام وایە کە دەبێت هەمیشـــە وێڵی شتە بەنرخەکان بین! ئەوسا بە دەستیان دەهێنین!

من لە نێو ئەم هەموو ئاپۆڕای مرۆڤەدا، هەستم بە تەنیاییو

غوربەت دەگرد، شــوێنێکم بۆ پشــووی ڕۆحم دەستنەدەکەوت، دەمویست لە دەست مرۆڤەکان هەڵێم!

مرۆڤەکانم دەبینی تەنها بە شــوێن جوانی ڕووخســارەکاندا سەرگەردان بوون!

ئــای لــەو هەمــوو جوانییــەی بونــەوەر... مــرۆڤ چەند مەحرومیت!

بەڵام تیشکی جوانی نوری دڵەکان، خەندەی ئەفسوناوی لێوی مرۆڤە فریشتە ئاساکان، کەس لێی نەدەپرسی!

ئەو کاتەی کــە دەمبینی مامەڵەی مرۆڤــەکان تەنها لەگەڵ جەســتەدایە، من وێڵو سەرگەردانی ئەو کەسە بووم کە مامەڵە لەگەڵ ڕۆحمدا دەکات، وەکو خۆت گوتت: ئەو کەسەی دەست لە ڕۆحم دەدات، پێش ئەوەی دەست لە جەستەم بدات!!

من ســوتاوی ئەو گڕەم کە لە ناخمەوە ســەری هەڵداوە، من شــەیدای نوورم، ئەوەی شەیدای نووربێت، دەبێت باکی سوتانی نەبێت!

من عەودالی جوانێك نەبووم، من بە شوێن کەسێکدا دەگەڕام هەموو دونیام بۆ بڕازێنێتەوە!

چی قەدەرێکی ســەیر بوو، لە یەکەم دیداردا پەراوی ڕۆحت خوێندمەوە، وەکو لێم بپرســی تۆ لە کامیانی، طالیبی ڕوو، یا طالیبی ڕوح؟!

یەکێ عاشق بە خوو، یەك طالبی ڕوو

یەکێ مەجبوری بۆ، یەك مایلی ڕەنگ «مەحوی»

لە بیرتە گوتت هەندێك بە چاوو هەندێك بە گوێ شەیدا دەبن!

من هیچیان نەبووم، نە بە چاوو نە بە گوێ، بەڵکو بە ڕۆح!

تەنها مرۆڤە گەورەکانن کە نرخی هەموو شتێك دەزانن، هەموو وشەیەك، هەموو نیگایەك، هەموو چرپەیەك، هەموو هەستێکی پاك.

ئەوانن دەزانن خوداوەند چ بەهرەیەکی پێداون، چۆن خەڵاتی کردوون، هەربۆیە ئەگەر هاودەمی ڕۆحی خۆیان دۆزییەوە، ئیتر هەرگیز فەرامۆشی ناکەن، بۆ ساتێك لە یادی غافڵ نابن، وەکو مەحوی دەڵێ:

شوکورتۆلەفکرم ناچی، ئەگەرچی من لە فکرت چووم

لە من غایب نەبی تۆ، بەسمە، با من بم لە تۆ غایب!

لەم ژیانەدا مرۆڤ چۆن دەتوانێت دوور لە کەسێك بژی کە هاودەمی هەناسەکانێتی، لە دژواری ئەم زەمەنە سەختەدا بەرەو کەناری دڵنیایی دەستی دەگرێت، ڕۆژانە ڕۆحی دەدوێنێ‌و لە باوەشی گەرمی وتەی شیرینی‌و هەستی پەپولە ئاسادا خەونەکانی چرۆ دەکەن!

لەم زەمەنی مادده پەرستی‌و ساختەکاری‌و مرۆڤانی هەزار

ڕوودا، چرایەك ببێتە هاودەمت، بەهەشتێك ببێتە ژوانت، باوەشێك ببێتە هێلانەت، فەرهەنگێك پەیڤی جوان ببێتە پەیامت، دڵێکی سپی، نیگایەکی شەرمن، خەندەیەکی ئەرخەوانی، هەمیشە وەکو پروشەی بارانێکی نەرم، سۆزو ئەوینت بەسەردا ببارێنێت، ئیتر دەبێت سەعادەت لەمە گەورەتر چی بێت؟!

ئای خوداوەندی گەورە، تۆ چەند میهرەبانیت، من ناتوانم بێ لوتفی تۆ ئەو ژیانە وێنا بکەم!

ئای ئەگەر لوتفی تۆ نەبا، لە چی دۆزەخێکدا دەبووم!!

ئێستا دەزانم ژیان بێ سۆزو میهرو ئەوین، ژیان بێ ئامانجی بەرز، بێ هەوڵو ماندووبوون.

بێ هاودەمو هاو ڕۆح، بێ دڵسۆزیو ڕاستیو پاکی، واتە دۆزەخ!!

شەو درەنگە، چراکەم هێدی هێدی وەنەوز دەدات، پەروانەکانیش دەمێکە سوتاون.....

چەند ساتێکی کەمەو ئەم چرایەی بەردەستم خامۆش دەبێت، بەڵام تکات لێدەکەم ئەو چرایەی کە تۆ لە نێو دڵمدا هەڵتکردووە، نەهێڵی خامۆش بێت..

من ئیتر شەیداو عاشقی ئەو چرایەم.....!

ڕۆحم وابەستەی پەیامە زیوینەکانی تۆیە، شەپۆلی نیگای پڕ میهرو سۆزی تۆ بۆ من خۆری هەموو ئاواتو خۆزگەکانمە،

هەرگیز لەو چرایە مەحروومم نەکەیت..

نەکەی بە تەنیا لە تاریکستاندا بەجێمبهێڵی..

نەکەی دەســتم بەردەی‌و لە نێوەڕاستی ڕێگادا، ماڵاواییم لێ بکەی..

تکادەکەم هاوڕێم بە، تا دواساتەکانی تەمەن، تا نێو باخەکانی بەهەشت..

لەم سەفەرە موبارەکەدا هاودەم‌و هاوڕازم بە..

شــەو درەنگە چاوەڕوانی بەرەبەیانێکی نوێم، لە چاوەڕوانی تۆدا!!

بە ئاواتی ڕۆژێکی نوێ، ڕووەو ئاسۆ بێدارم!

من دەزانم خۆشەویستەکانمان هەرگیز دڵیان نایات بەجێمان بێڵن..

من دەزانم تۆ هەرگیز من جێناهێڵی..

مــن‌و لاشــەی پەپوولــە ماینــەوە بــەس
شــەوی دووری شــەمیش تــواوە لــە کــۆڕا.

(هێمن)

سەرەتا پێستی مرۆڤەکان سەرنجی ڕادەکێشام، بە تەنها تەماشای ڕووکەشی جەســتەی مرۆڤەکانم دەکرد، پاشان زانیم کە ڕۆحێك لە ژێر پێســتو ڕووپۆشــی مرۆڤەکاندا هەیــە، وەلێ دواتر زانیم کە بە پێچەوانەوەیە، لە حەقیقەتدا ڕۆح دەکەوێتە ســەر پێستی مرۆڤەکان.. ئەوە ئێمەین کە نایبینینو تەنها پێستی ناسكو جوان فریومان دەداتو ناتوانین بە ڕۆحەجوانەکان ئاشنا بین!

یەژن پادشــایەك دوو کۆیلەی هەبوون، یەکێکیان زنجییەکی ناشــیرینی ڕەش پێســت، بەڵام ئاکارجوان، ئــەوی دی جوانو قەشەنگ وەلێ بەد کردار!

جارێکیــان شــا کۆیلــە جوانەکەی بــۆ کارێك نــاردو کۆیلە ناشیرینەکەشی بانگ کردو پێی گوت:

من دەزانم تۆ کۆیلەیەکی ژیرو شارەزای، بەڵام هاوڕێکەت هەرچی ناوو ناتۆرەو سیفەتی خراوە دەیخاتە پاڵی تۆو تۆ بە کەسێکی دزو بێ شەرموحەیا ناودەبات، ئەمە چۆنە، ئایا ڕاست دەکات؟!

شا، ویستی بەم قسانەی تورەی بکاتو دەماری ڕقو تورەییو تۆڵەسەندنی بوروژێنێ، تا ئەویش دژ بە هاوڕێکەی قسان بکات!!

بەڵام وەڵامی ئەو چاوەڕوان نەکراو بوو!

گوتی: گەورەم هەموو ئەوەی هاوڕێکەم دەیڵێ ڕاســتن، بەڵکو زێتر لەوەی کە بۆی باسکردووی خووڕەوشتی خراپم هەن، وەلێ ئەو لەبەر باشــی خۆی زۆرێك لە خووڕەوشتە خراپەکانی منی

باس نەکردووەو تەنها کەمێکی درکاندووە!

پاشا گوتی: باشە، کەواتە وەکو چۆن ئەو عەیبەکانی تۆی بۆ باسکردووم، تۆش چەند عەیبێکی ئەوم بۆ باس بکە.

گوتـــی: گەورەم لـــە عەیبەکانی ئـــەو ئەوەیە کە کەســـێکی خۆشەویستو بەوەفاو بەخشندەیە، هەروەها دوو عەیبی تریشی هەن ئەویش قوربانیدانو خۆبەکەمزانین!

دواتـــر هەمـــوو ســـیفەتە جوانەکانـــی ڕیزبەنـــدی کردو بە جوانترین شێوە وەسفی کرد!

لەوەودوا، شـــا ئەمی نارد بۆ کارێكو کۆیلە جوانەکەی بانگ کردو پێی گوت:

ئەو کۆیلە ڕەش پێستە ناشیرینەی هاوڕێت، بە ناشیرینترین شێوە وەسفی کردیتو هەرچی سیفەتی خراوە بە تۆی بەخشیوەو تۆی بە کەســـێکی زۆر بەدڕەفتار بە من ناساند، لە کاتێکدا من تۆ بە کەســـێکی زیرەكو بەهرەمەندو پێچەوانە بە قســـەکانی ئەو دەبینم!

هەر لەگەڵ بیستنی قســـەکانی شادا یەکسەر دەریای تووڕەیی هەڵچوو، بە شێوەیەك کە کۆنترۆڵی خۆی لە دەستداو بە لێشاو دەستی بە قســـان کرد، لەلایەك باسی باشیو سیفەتە باشەکانی خۆی دەکردو لە لایەك هەرچی سیفەتی ناشیرین بوو دەیخستە پاڵ هاوڕێکەی، هیچ عەیبو عارێك نەما نەیداتە پاڵی!

لێرەدا پاشا فەرمانی دا لە کۆڕو مەجلیسی شاهانەی وەدەرنێن، پێی گوت: ئەی خاوەنی نەفسێکی پیس‌و بۆگەن، هەرچەندە ڕووخساری ئەو پیاوە ڕەشە، بەڵام ناخی سپیترە لە بەفر! تۆش هەرچەندە ڕووخسارت سپییە، وەلێ دڵت تاریک‌و ڕەشە، ئاوابە لەبەرچاوم‌و ئیدی جارێکی تر نەتبینم!

ئەم چیرۆکە زۆر جێگای سەرنجە! مرۆڤبوون زۆر سەختە! مرۆڤ بە سانایی ناتوانێت مرۆڤ بێت، تا ئێمەش مرۆڤ نەبین، ناتوانین مرۆڤەکان بناسین!

حەکیمێك بە نوێژی نیوەڕۆ بە چرایەکەوە بە نێو کوچەو کۆڵانەکاندا بە عەودالی دەگەڕا!

لێیان پرسی: بۆچی دەگەڕێیت کون بە کون، بەم ڕۆژی ڕووناکە ئەم چرایەت بۆ هەڵگرتووە؟

- لە مرۆڤ دەگەڕێم، مرۆڤ!

- سەیرە، مەگەر ئەم هەموو مرۆڤە نابینیت؟ ئەم بازاڕە گەورەیە نابینیت کە پڕە لە مرۆڤ؟

- نا، نا، ئەم کارە بەو شێوەیە نییە کە بۆی دەچن، من بەشوێن مرۆڤێکی ڕاستەقینەدا عەودالم، ئەگەر ئەو مرۆڤەم دەستبکەوێت، ئامادەم ببمە خۆڵی ژێر پێیەکانی!

ئای کە وتەیەکی بەرزە: ئەگەر ئەو مرۆڤەم دەستبکەوێت، ئامادەم ببمە خۆڵی ژێر پێیەکانی!

ئەوینی وەها مرۆڤێك ئەوینێكی هێندە مەزنە، بە شێوەیەك گەیشــتن بە وەســڵی ئەو مرۆڤە ئاواتێكــی مەزنە، ئەگەر دوای مردنیش بێتە دی بۆیە نالی دەڵێت:

یــا توربەتــێ، یا غوربەتــێ، یا ڕێ بشــكێنین

هــەر مونتەزیرە نالی، ئەگــەر مردوو ئەگەرما

مەولانای ڕۆمی دەڵێت: خەڵكی تەماشای جوانی پەرداخەكە دەكەن، وەلێ من مەفتونی ئەو شەرابەم كە تێیدایە، چ سودێكی هەیە ئەگەر پەرداخەكە زێڕ بێ‌و ئەوەی نێوی سركە!؟

ئــەو دەڵێــت: وێنەو جوانی نماو ڕووكەشــی مــرۆڤ، وەكو نەخــش‌و نیگاری ســەر پەرداخەكــە وان، وەختێك پەرداخەكە دەشــكێت، ئیدی نەخش‌و نیگار ئاوا دەبــن، كەواتە تۆ وەدووی شتێكدا بگەڕێ كە ئاوا نابێت!

دەبــا ئێمــەش چراكەمان هەڵگرین‌و بۆ گەیشــتن بە مرۆڤ عەوداڵبین!

تا نەیاندۆزینەوە، تا پڕ بە ســینەمان بۆنی مرۆڤ نەكەین، تا لە باوەشی سۆزو میهرەبانی مرۆڤە ڕاستەقینەكاندا پشوو بە ڕۆحمان نەدەین، تامی ژیان ناكەین!!

با ماندوو نەبین، با هەموو دەشتو دەرێك بگەڕێین، لە هەموو ماڵ‌و لەودیوی هەموو دەروازەیەكەوە بگەڕێین، با عاشقی مرۆڤ بین‌و لە پێناو گەیشتن بە ئەودا هەموو قوربانییەك بدەین...

ئازیزی من..........

گولاو تەنها وێنەی گوڵ نییە، بەڵکو فرمێسکی قەتیس ماوی سەدان گوڵەباخی سوتاوە، کە لە ئەویندا تواونەتەوەو بوون بە ئاو، بۆیە هەموو بوونەوەر گولاو پرژێن دەکەن!!

من بۆ گەیشتن بە تۆ، ڕێبوارێکی ماندوو نەناسم، ئەوینی گەیشتن بە تۆ ڕازاوەترین خەونی ژیانمە، ئەو ئەوینە تێکەڵ بە خوێنو گۆشتم بووە، لە نێو پێڵووی چاوەکانمدا، لە تروسکەی سۆمای دیدەمدا، وەکو ئەستێرە دەدرەوشێتەوە! تێکەڵ بە هەناسەکانمە، لە نێوەڕاستی دڵمدا نەخشاندوومە!

هەموو بەربەستەکانم وەلا ناوە، چونکە دەزانم ئەگەر بەردو زیخی ئەم بەرو ئەوبەری چەم نەبا، هەرگیز دەنگی خوڕەی ئاو هێندە خۆش نەدەبوو!

من لە دووری تۆ، دەربەدەرو بێ ماواو بێ مەسکەنو ئاوارەم، من هەتا ناسنامەی مرۆڤانەی خۆم نەدۆزمەوە، ناگەم بە تۆ.. منی بچوك ناگەم بە تۆ..

لە قوربی «قاب قوسین»ی دوو ئەبرۆت

منی «أدنی» چ دوورو دەربەدەر مام.. «نالی»

کەواتە دەبێت هەموو ئازارێك قبوڵ بکەم!

بەڵکو هەموو زەحمەتو ئازارو ناڕەحەتییەك بەوپەڕی ڕێزو شەرەفمەندییەوە پەسەند بکەم!

مەحوی ئاسا دەڵێم:

لەسەرخۆچوونە،شەیدابوونە،قورپێوانە، سووتانە

هەتا مردن،مەحەببەت ئیشی زۆرە، ڕیزی لێدەگرم

تۆ پێت وایە پەشیمان دەبمەوە؟

دەکرێ شەیدای نوور پشت لە ڕووناکی بکات؟

دەبێت سوتاوی ئەوینی حەقیقی، ئەوینداری فەرامۆش بکات؟

کەس دەتوانێ بێ ڕۆح بژی؟ تۆ سەرچاوەی ڕۆحو گیانی منی!

ئیتر قەت مومکینم نابێ، خەیاڵی تۆ لە دڵ دەرکەم

چ کەس؛ بێ قووتی ڕۆح،ناشێ بژی هەرگیز لە دنیادا.. «کوردی»

تکا دەکەم بێ هیوام مەکە، هەمیشــە پێم دەڵێی ئەم ڕێگایە ســەختە، بەردەوامبوون زەحمەتە دڵنیابە دەزانم، لە خۆڕا ئەم ڕێگایەم هەڵنەبژاردووە، دەزانم چ ڕێگایەکی خەتەرناکە.

دەمێکە ئەم دێڕە شیعرەی نالیم لەسەر زارە:

بۆ هەرکەسێ مەبذولە طەریقێکی ئەمانەت

هەر عاشقی بێ چارە لە ڕێی خەوفو خەتەرما

پەیمانــت پێ دەدەم، لە پێناوی گەیشــتن بە تــۆدا، هەموو خۆشیو هەواو ئارەزووەکانم وەژێر پێی بخەم!

ڕۆژانە بەرەو ئاســمان هەڵکشێم، بە پێپلیکانە نورانییەکاندا بەرەو نــوری خودایی پلە پلە بەرز ببمەوە، دڵنیابە من بڕیارم داوەو پەروەردگاری میهرەبانیش شاهیدە!

من دەزانم لە ڕێگای خۆشەویستی خوداوە نەبێ، ناگەم بە مرۆڤبوونی خۆم، تا ئەو خودا گەورەیە نەناسم خۆم نادۆزمەوە، بۆ گەیشتن بە ڕازیبوونی خودا، ئامادەم بەڕاستی هەموو شتێك فەرامۆش بکەم، چیم فەرمان پێ بکات، بە دیدەم ئەنجامی دەدەم، گەر وامان کرد، خوداوەند زۆر لەوە بەخشندەو میهرەبانترە کە دووبارە دڵی دڵشکاوێك بشکێنێ، بەڵام ئەگەر ئێمە بەڕاستی خۆشەویستیو ئەوینی ئەو خودایە بە دەستبهێنین.

نەك وەکو ئەو کابرایەی کە نوێژی دەکردو مەجنونی لەیلێ بەسەر بەرماڵەکەیدا تێپەڕیو ئەویش نوێژەکەی بڕیو پێی گوت: ئاخر نەفام من لەگەڵ خودای خۆمدا لە ڕازو نیازدا بووم، تۆ چۆن ئەو پەیوەندییەت پچڕاند؟

مەجنون گوتی: "هەیهۆو کابرای لە هیچ حاڵی نەبوو پێم سەیرە، من عاشقی عەبدێکم، تۆم نەبینیو لە تاوی ئەویندارەکەم هیچ بەدی ناکەم، چما تۆچۆن عاشقی خودایتو منت بەدی کرد؟»

ئەو کاتەش دەگەمە بەردەرگای دیوەخانەکەت، وەکو ئەویندارەکەی مەحوی پێم نەڵێی:

............ منو تۆ ئافتابو سایە تیمسالین
جەنابی من کە دەرکەوتم، دەبێ تەشریف تۆ بڕوا
من ئیدی ئەو هەوارە جێناهێڵم،......
ناتوانم ئەو ژووانە فەرامۆشکەم!!


گەر سێوێک بوو لەتی دەکەم
لەتێک بۆ خۆم لەتێک بۆ تۆ
بزەیەک بوو لەتی دەکەم
لەتێک بۆ خۆم لەتێک بۆ تۆ
خەفەتێک بوو، بەشت نادەم
هەڵیدەمژم وەک دوا پەتۆ!
- پەشێو -

گەر بتەوێت هەمیشــە وەکو منداڵ مامەڵە بکەیت، هەمیشە دڵت منداڵانە بێتو هەســتو نەســتو ئەوینو خۆشەویســتیت زادەی دڵی منداڵێك بێت، وەکو منداڵەکان بدوێیت، وەکو ئەوان پێ بکەنیت، وەکو ئــەوان تورە بیت، وەکو ئەوان بگریت، پاکو بێگەردبیت وەکو ئەوان!

ئــەوا دەبێت زۆر زەحمەت بکێشــی! بســوتێیو وێڕای لێوت دەبێت ڕۆژانە دڵت هەڵقرچێنی!!

گــەورەکان کاتی ئەوەیــان نییە لە پێکەنینــی تۆ تێبگەن، چونکە ڕووی ناشیرینی خۆیانی تێدا دەبینن!

گــەورەکان نایانەوێت لە گریانی تۆ بگەن، چونکە دەریایەك لە هەســتو ئەوینی پاکیان پێویســتە! ئەی نابیســی شەوانە تا بەرەبەیان منداڵەکان دەگرین.. تەنها وا دەزانن ئەوان بۆ شــیر دەگرین!

نــا ئازیزەکەم، منداڵەکان دەیانەوێــت هەموو جیهان ڕەنگی وەکو ڕەنگی شیر بێت!

هەربۆیە بە ئاسانی ژێر نابنەوە!

هەموو گەورەکان دەزانــن، منداڵ چەند پاکو بێگەردە، دڵە بچکۆلەکەیــان چەنــدە گەورەیــە، چەندە میهرەبانــە، نیگایان چەندە ڕووناکە! ڕووخساریان چەند نورانیە!

بەڵام گــەورەکان ناتوانن چی دی پاکبن وەکو منداڵ! یاخود خۆیان نایانەوێت!

هەمیشــە خوداوەندیــش دەیەوێت ئێمە منــداڵ بین «کیوم ولدته أمه» *

کاتێــك منداڵێك ماچ دەکەیت، دواتــر پێی بڵێ: ئادەی تۆش ماچمکە!

چەند بە پاکی، چەند بە ناسکی لێوی دەنێت بە ڕوومەتتەوە!

پێی بڵێ: دەســتکە ملم، دەست لەملانم بە، چەچە بچکۆلەکانی چۆن دەخاتە سەرشانت، سەرە بچکۆلەکەی چۆن دەکاتە سەر سینەت!

چەند جیاوازن ئێوە لە گەورەکان؟!

کاتێك گەورەیەك ماچم دەکات، باوەشم پێدا دەکات، خەریکم دەخنکێم!!

بــەڵام من هەرچەندە گەورەکان ئازارم بدەن، من هەمیشــە هــەر بە منداڵــی دەمێنمەوە، دڵی منداڵی خــۆم ناگۆڕمەوە بە هەموو دونیا، هەرگیز وەکو گەورەکان ئەویندارى ناکەم، چونکە باوەڕم پێی نیە!!

هەرگیــز وەکو گەورەکان تەماشــا ناکەم، تــا کەس لە نیگام نەترسێ!! هەرگیز وەکو گەورەکان نادوێم، تا دڵی کەس بریندار نەکــەم، کــەس لە خــۆم نەتۆرێنــم! هەرگیز وەکو گــەورەکان تورەنابم، چونکە ئەوان کە تورە دەبن، نازانن دەڵێن چی!! هەموو سنورەکان دەبەزێنن، بۆ سەرکەوتنی خودی خۆیان هەموو شتێ دەکەن، هەموو بەهاکانیان دەخەنە ژێر پێڵاوەکانیانەوە، هەموو شتە گرنگەکان لە دەست دەدەن!

زۆر لــە خۆیــان ڕازین بە وێنــەی گەڵازەردەکانــی پاییز، بە نەزەری خۆیان بوونەتە ئاڵتون، بۆیە وەها زەردن، وەلێ شنەبایەکی خەزان دەیانخاتە خوارێ! لە شوێنێکی نزم فڕێیان دەدا!

گەورەکان بۆیان بکرێت بۆ ساتێکی توڕەبوونی خۆیان، جیهان دەسوتێنن!

ئیتر پێم نالێی ئەوان ئەوینو خۆشەویستی لە کوێ دەزانن؟!

ئێمــە بۆ چەنــد ســاتێکی کــەم توڕەدەبینو پــاش چەند چرکەیــەك دەســت دەکەینــەوە ملــی یەکتــرو هیچ لــە دڵە بچکۆلەکەماندا هەڵناگریــن، نایەڵین ڕقوکینە لەگەڵماندا بێتە ژێر پەتووەکەمانەوە!

لەبەرئــەوە لەگەڵ سەرخســتنە سەرســەریندا دەچینە نێو قوڵایی خەوێکی ئەرخەوانی!

ئێستاش چیرۆكو شــیعری منداڵان دەخوێنمەوە، تەماشای کارتۆنی منداڵان دەکەم، خەندەی منداڵێك، نیگایەکی منداڵانە، تەوقــەی منداڵێــك لــە ئامێزگرتنــی منداڵێك، لە هەرە شــتە بەهادارەکانی ژیانمە!

دەزانم ژیان بەمجۆرە ســەختە، هەمیشــە منداڵــی دژوارە، وەلــێ ئــەوە ئیختیاری خۆمە، بەم کارەم ئاســودەم، هەرچەندە گەورەکان وەك هەمیشــە ئازارم دەدەن، نایانەوێت لەم جیهانەی من نزیك ببنەوە، لێم تێبگەن، ئەوان هەمیشــە ژیانیان پڕێتی

له کێشــەو ململانێ، تەنها خودی خۆیان خۆشدەوێت، لە پێناو بەرژەوەندییەکانی خۆیاندا، هەموو شتێك دەکەن!

دەیانەوێــت بێ ماندووبوونو قوربانیــدان، بە هەموو هیواو ئارەزووەکانی خۆیان بگەن!

هەمیشە بەرامبەر بە یەکتر لە سەنگەردان، بێئەوەی لە یەکتر تێبگــەن، وەڵامی یەکتر دەدەنەوەو بە گژ یەکدا دەچن، زۆربەی ئەو وشانەی کە زۆر بەکاریدەهێنن لە واتاکەی نەگەیشتوون!

من هەرگیز واز لە منداڵی خۆم ناهێنم، چونکە تەنها متمانە بە ئەوینو خۆشەویســتی منداڵانە دەکەم تەنها ئەو کەســانەم خۆشــدەوێ کە وەکو منداڵ خۆشــیان دەوێم، من خۆشەویستی گەورانەم پێ قبوڵ نییە! ڕاستتر بڵێم گەورەکانم خۆشناوێت!!

تەنها ئەو گەورانە نەبێت کە هێشتا هەر منداڵن....

چی بڵێم ئیدی، هەرچەندەی بڵێم من لە دنیایەکەوە قســان دەکەم کە گەورەکان لێم حاڵی نابن. گۆران ئاسا دەبێت بڵێم:

هــەرچــەن ئــەکــەم، ئــەو خــەیــاڵــەی پــێــی مــەســتــم
بــۆم نــاخــرێــتــە نــاو چــوارچــێــوەی هــەڵــبــەســتــم
لــێــکــدانــەوەی دەروون، قــســەی زمــانــم
بــۆچــی وەهــا دوورن لــەیــەك؟ نــازانــم!
ئــەمــویــســت دەروون بــکــرایــەوە وەك تــۆمــار
دەرکــەوتــایــە دنــیــای جــوانــتــر لــە بــەهــار

دەرکــــەوتــــایــــە: ئــــاوات، هــیــوا، خــەوبــیــنــیــن
پــرشــنــگــدارتــر لــە ئــەســتــێــرەی قــوبــەی شــیــن!
دەرکــــەوتــــایــــە: مــــانــــای مــەنــگــی دەریــــایــــی،
کــە نــەرمــەبــا لــە ڕووی ئــــەدا ئــەســپــایــی
دەرکــــەوتــــایــــە ئــــەو دونــــیــــایــــە کــــە شــیــعــری
بــێ فــرمــێــســکــەو، زۆرتــــر لــە فــرمــێــســك ئــەگــری

لەو دونیای منداڵیەدا، ئەوینو خۆشەویستیو پاکیو بێگەردی دەگاتە لوتکە، بەڵام تەنها کەسـێك لێیان تێدەگات کە لە زمانی منداڵان بزانێت، هێشتا هەر منداڵ بێت ئەگەر نا ئەوان دەبێت هەر بە تەنیا بسـوتێن، بە بێدەنگی لـە ناخی خۆیاندا هەموو ئەوینێك بشارنەوە، دەبێت ڕۆحی خۆیان ببەخشن تا بیسەلمێنن چەندە شەیدان، بە چی ئەوینێك گرفتارن.

نازانم چیرۆکی ئەو کیژۆڵە چکۆلەیەت نەخوێندۆتەوە....؟

ئـەو کچۆڵـە منداڵە بێ باوکەی لـە کەلاوەیەکی ڕووخاودا لەگـەڵ دایكو برا بچکۆلەکەیدا دەژیا، ئەو کچۆڵەیەی وانەیەکی بەرزی ئەوینو بێگەردیمان فێردەکات.

هاوڕێکەم گوتی: شەوانە وا ڕاهاتبووم کە تاوێك بچمە دەرێو هەوایـەك هەڵمژمو پاشـان دەگەڕامەوە ماڵێ، لەسـەر ڕێگاکەم شـەوانە بچکۆلەیەکی شـەش حەوت سـاڵانم دەبینـی، لە ژێر ڕووناکی یەکێك لـە گڵۆپی کۆڵانەکاندا پەپولەکانی ڕاو دەکردو بە دوویاندا ڕای دەکرد!

جلو بەرگـو سیمای سەرنجی ڕاکێشام، کراسێکی کۆنی لەبەردا بوو، پێڵاوەکانی دڕابوون، قژی خاوو درێژ بوو، چاوەکانی شینو جوان بوون، ئەویش لە دوورەوە تەماشای دەکردمو پێدەکەنی!

شەوێك وەستاندمو لێم پرسی ناوت چییە؟

گوتی: شەیما..

پێم گوت: ماڵتان لە کوێیە؟

بـــە پەنجە بچکۆلەکانی ئاماژەی بۆ ژوورێکی بچکۆلە کرد لە نزیك یەکێك لە خانووەکانی گەڕەك، گوتی: ئەوە ماڵی ئێمەیە، منو دایکمو هێمنی برام لەوێدا ژیان بەسەردەبەین.

گوتم: ئەی باوکت؟

گوتی: باوکم شۆفێری ماشین بوو لە کۆمپانیایەکدا، بەڵام لە ڕووداوێکی هاتووچۆدا گیانی لە دەستدا.

پاشان بە پەلە ڕایکرد، وەختێك چاوی بە هێمنی برای کەوت بەرەو لای ئەم دەهات.

لەوەو دوا شـــەوانە هەر کاتێك بەوێدا ڕادەبووردم، لەگەڵیدا ڕادەوەستام، قسەم لەگەڵدا دەکرد!

شەوێکیان پێم گوت: ئارەزووی چی دەکەیت؟

گوتـــی: هەموو بەیانیەکی زوو، دێمـــە دەرێ دەچمە کۆتایی شەقامەکە، تا دیمەنی قوتابییەکان ببینم کە دەچنە ئەو جیهانە ســـیرەوە، لە دەرگایەکی بچکۆلەوە بە جلوبەرگێکی وەکو یەك دەچنە ژوورێ، نازانم لەو دیوی ئەو دیوارەوە چی دەکەن، بەڵام

هەمـــوو بەیانیەك خۆزگە دەخـــوازم منیش جلێکی وەکو ئەوان لەبەر بکەمو لەو دەرگایەوە بچمە ژووری!

هاوڕێکـــەم گوتی: نازانـــم چی هێزێك بوو بـــۆ لای ئەو کیژۆڵەیە پەلکێشی دەکردم هیواو خۆزگەکانی، چاوەکانی، وتە شیرینو سادەکانی!!

نازانم، تەنها ئەوەندە دەزانم ئەو کەنیشـــکە کەمەندکێشـــی هەســـتو نەستی کردبووم، شـــەوانە لەگەڵ خۆمدا جلوبەرگـو پێڵاوو، یاری منداڵانەو شیرینیم بە دیاری بۆ دەبرد.

شـــەوێکیان پێی گوتـــم: کچێك کە لە ماڵی دراوســـێکانماندا نۆکەری دەکات فێری دروومانو نەخشو چنینی کردووم، داوای لێکردم، پارچەیەك قوماشو دەرزیو دەزووی بۆ بێنم، شەوێکی تر داوایەکی سەیری لێکردم، پێی گوتم: دەمەوێت فێرم بکەیت، بنوسم "خۆشم دەوێیت."

یەکســـەر منو ئەو لەســـەر زەوی دانیشـــتین، بە چیلکەیەك لەسەر خۆڵەکە چەند جارێك بۆم نووسی "خۆشم دەوێیت!"

ئەویش تەماشای دەکردمو فریشتە ئاسا پێدەکەنی!

دواتر شـــەوانە بـــۆم دووبارە دەکردەوە تا بـــە جوانی فێری نوسینی بوو..

شـــەوێکیان کە ئاســـمان بێ تریفەی مانگە شـــەو بوو، دوای ئەوەی وەکو شەوانی دی قسەمان کرد، پێی گوتم: چاوت لێکبنێ، نەمزانی بۆچی سووربوو لەسەر ئەوەی چاوم لێك بنێم. منیش لەسەر داوای ئەو چاوەکانم لێکنان.

توند دەســتی گرتمو ماچی کردو بە خێرایی بەرەو خانووە بچکۆلانەکەیان ڕای کردو لە چاوان ونبوو!

بــۆ ڕۆژی دوایی ســەفەرێکم هاتە پێشو دوو هەفتە شــارم بەجێهێشت، نەمتوانی مالاوایی لێبکەم، ڕۆیشتمو بەجێمهێشت، دەمزانی کە هەموو شەوێك چاوەڕوانم دەکات!

کاتێك گەڕامەوە بۆ شــارەکەی خۆم هێندەی تاسەی دیداری شــەیما بووم، بە تاســەی هیچ شــتێکی تر نەبووم، ئەو شــەوە زوو ڕۆیشتمو پێش وەخت گەیشتمە جێ ژووانی شەوانە، بەلام چرای کۆلەکەی کارەباکەی لە ژێریدا دادەنیشتین نەدەسوتا، بێ دەنگیەکی سامناك بالی بەسەر شەقامەکەدا کێشابوو، هەستم بە شتێکی نامۆ دەکرد، زۆرم چاوەڕوان کرد بەلام نەهات!

پێنج شەو دواتر هەموو شەوێك دەهاتمە ئەوێ، بەلام ئەو هەرنەهات! بڕیارم دا سەردانی دایکی بکەم، گوتم لەوانەیە نەخۆش بێت!

زۆرم لە خۆمکرد بە شەرمێکی زۆرەوە لە دەرگام دا، سەرەتا هێمنی برای هاتە دەرێ، دواتر دایکی، کاتێك منی بینی گوتی:

خوایە گیان، لە دواییدا هات، شەیما چۆنی وەسف کردبووی، وەها بوو، پاشان لە پرمەی گریانی دا!!

زانیم شــتێك ڕوویداوە، پێم گوت: تــکات لێدەکەم پێم بلێ چی ڕوویداوە؟

گوتی: شــەیما مرد، پێــش ئەوەی چاوەکانــی لێکنێ گوتی: پیاوێك دێت هەوالم دەپرسێت، ئەگەر هات ئەمەی بدەرێ..

گوتم: ئەو کەســە کێیە؟ گوتــی: حەتمەن هەردێت، کە هات ئەم پارچە قوماشەی بدەریٚ!

دایکی گوتی: شــەیما نەخۆش کەوت، تایەکی قورســی گرت، نەمانتوانی لە نەخۆشــخانەی ئەهلی بیخەوێنین، نەخۆشخانەی گشــتیش کارێکی وەهایان بۆ نەکرد، لە ماڵەوە زۆر هەوڵمدا بە پەڕۆی تەڕ تاکەی دابەزێنم، بەڵام بە بەرچاومەوە گیانی سپارد!

لە ڕێگا کاتێك پارچە قوماشەکەم کردەوە بە نەخشو نیگارێکی جوان نوســیبووی "خۆشــم دەوێیت" چەند دڵۆپە خوێنێکیش بەسەر پەڕۆکەوە بوو، زانیم ئەوە ئەو دڵۆپە خوێنانە بوون کە بەهــۆی دەرزیو درووманەوە لە پەنجــە بچکۆلەکانی هاتبوون، ئەوسا زانیم بۆچی دەیویست فێری نوسینی ئەو وشەیە بێت!!

ئەو وشەیە ڕاستترینو پاکترین وشەی خۆشەویستی بوو، کە لە ژیانمدا بیستبووم!

بە خوێنی خۆی، بە برینەکانی، بە ئازارەکانی بۆی نوسیبووم!

ئەو شــەوە دوا شــەو بوو کە بــەو شــەقامەدا تێپەڕبوورم، هەرچەنــدە ئەویٚ بۆ مــن ئەلبومی یادگاری جــوان بوو، بەڵام خەمو ئازارێکی گــەورەی بیر دێنامــەوە !لەبەرئەوە نەمتوانی چیدی بچمەوە ئەو ژووانە!

* پێغەمبەر (ﷺ) زۆرێك کردەوەی باشی باس کردووە کە دەبێتە مایەی پاکبوونەوەی باوەڕدار لە گوناهەکان، وەکو ئەو ڕۆژەی کە لە دایکبووە، هەڵبەت ئەمە بەرزترین پلەی پاك بوونەوەیە لە گوناهـ......

هەمیشــە ســكاڵام لە دووری تــۆ دەكرد، بــەڵام دواتر زانیم شــەرمە ئەویندار ســكاڵا بكات، من بێ وجودی تۆ شتێك نییە زیندەگیم پێ ببەخشێ، من بێ تۆ خودی خۆمم لێ ون دەبێت! بە بێ تۆ بیناییم لێڵە، نیوەڕۆی ژینم شــەوەزەنگە، ئیتر سكاڵا لە چی بكەم!؟

بمبەخشە ئیتر هەرگیز سكاڵا ناكەم!

من تا خۆم نەگەم بە تۆ، لە كێ پرسیاری تۆ بكەم..

لــە كــێ یـــارەب خــەبـــەر پــرســی بــكــەم مــن..

كـە هـەركـەس بـۆ خـەبـەر چـوو، بـێ خـەبـەر كـەوت!

"مەحوی"

تكا دەكەم بمبەخشــی، چونكە ئێســتا دەزانم كەسێك سكاڵا دەكات كە هیچ لە مانای ئەوینی حەقیقی نەگەیشتووە.

زانایــەك دەڵێــت: ئاو بۆ ماســی واتە ژیان، وشــكانی واتە: هەلاكەت !وەلێ كاتێك وێنەی ماسییەك لەسەر پارچە كاغەزێك دەكێشــی، ئەوكات نە خەبەری ئاوی هەیەو نە وشــكانی، چوون خــۆ ئەوە ماســی نییە، ئەوە تەنها نیگاری ماســییەكە لەســەر كاغەز، بە تەنێ شــكڵی ماسییەو بەس! ئیتر چوزانێ ئاو مایەی حەیاتی ئەوەو وشكانیش مایەی نەمانی!؟

مەخابــن! زۆربەی مرۆڤــەكان بە وێنەی ئــەو نیگارەن، بە شێوە مرۆڤن، وەكو چۆن وێنەكە بە شێوە ماسیە!

وەلێ هەیهات!

خۆ ئەگەر تەماشـــای ســـیمایان بکەیـــن دەبینین لوتو چاوو گوێچکـــەو زمانیـــان هەس! بەڵام لە حەقیقەتدا لاشـــەیەکی بێ هەست!

ئەوان بە لوتیان ناتوانن بۆنی خێرو خۆشـــیو ئەوین بکەن، گوێیان نییە تا باشـــترین وتەی پێ بژنەفـــن، بیناییان نییە تا جوانیەکانی پێ ببینن!

ئەی هاوار، من سکاڵا لە چی دەکەم، تۆ نەبای من ماسییەکەی ســـەر پەڕە کاغەزەکە دەبووم، نە دەریای مەحەببەتم دەناسیو نە عاشقی ئاو دەبوومو نە لە گڕی گەرمەسێر ڕامدەکرد!

ئەوســـا من مـــرۆڤ نەدەبووم، تەڵاشـــەدارێکی بێ گەڵك، بێ گەڵاو بێ گوڵ، بێ سایەو بێ سێوەر!

بمبەخشە! من تا ئەو کاتەی تۆم نەناسی نەمزانی ئەو مرۆڤە کێیە کە خوداوەند ئاســـمانو زەویو زەریاو دەریاکانی خستۆتە ژێر خزمەتی ئەو!

نەمدەزانی مرۆڤ هێندە گەورەیە لای خودا..

هیچم لە گەورەیی مرۆڤ نەدەزانی!

ئێستا دەزانم بۆچی کەس ناتوانێت تەماشای نێو چاوی خۆر بکات، چونکە هەموو دونیا شەرمی لێدەکات!

بەڵام مرۆڤە گەورەکان خۆریش شەرمیان لێدەکات!

چونکە خۆری ئەوان لە شەویشدا ئاوا نابێت!

ئێستا دەزانم بەهای هەموو شتێك سەرچاوەکەی ئەو نرخەیە کـە پێی دراوە، کەسـێك بە هەرزان شـتێکی چنـگ کەوتبێت، ئامادەیە هەرزان فرۆشی بکات.

مەولانـای ڕۆمی دەڵێـت: ئەو منداڵەی مروارییەك لەسـەر ڕێیەکـەی دەدۆزێتەوە نرخی نازانێت، ئامادەیە بە لەتە نانێکی بگۆڕێتەوە!

تـۆ گەر دەتەوێت نرخی ئەو مرواریيە بزانی، لەو مەلەوانە بپرسە کە بۆ دەنکی مروارییەك چۆتە نێو قوڵایی دەریا، ژیانی خۆی خستۆتە مەترسییەوە!

بڕۆ لە مرواری فرۆشێك لە نرخەکەی پرسیار بکە!!

ئەوان دەزانـن چۆنیان پەیداکـردووە! هەرگیز بە نرخێکی هەرزان بە کەسـی نادەن، ئەستەمە بتوانن بیبەخشن، بە خۆڕا بە ئاسانی دەستبەرداری نابن!

بمبەخشـە، من وەکو ئەو کەسـە وەها بووم، کە دەیویسـت چیایەك بخاتە نێو تەرازوو بیکێشێ!

بـەڵام کاتێـك هاتمـە پێـش، بەرامبـەر بـە چیـا ، منو تەرازووەکەم چەند بچوك بووین، لە سوچێکی سێبەری چیاکەدا هەر دیارنەماین!

من وەکو «کوردی» نەمدەزانی دەستکەوتنی مرواری چەندە

زەحمەتە، بۆیە سکالاّی دووریم دەکردو نەمدەزانی تەنها زیکری ناوی تۆ هەرە مەرتەبەی شەرەفمەندییە!

ڕۆژو شەو دایم لەبەر دیدەی خەیالّم حازری
سا چ فەرقێکی هەیە بۆ من ئیتر ئێرەو ئەویّ
بەس نییە لێرە ئەوێرم جاروبار باست بکەم
نەمدەوێرا قەت لەبەر ئەغیار کە ناوت بەم لەویّ

هیچ لە مستەفا بەگ حالّی نەدەبووم کە دەیگوت:

گەردنم با تەوقی تۆی تێدا بیّ ئازادی مەکە
تەبعی من ئەم میحنەتەی پێخۆشە تۆ شادی مەکە

ئێستا دەزانم بۆچی ناتوانێت تەوقی گەردنی لابەریّ، ئەو ئیتر گەیشتۆتە حەقیقەت، سێبەری حەقیقەت شتێکەو خودی خۆشی شتێکی تر!

وەکو جیاوازی بالّندەو سێبەرەکەی، سێبەر لەسەر خاکە وەلیّ بالّندەکە لە ئاسمان!

ئێمە وامان دەزانی ئەگەر سێبەرەکە بگرین، ئیتر خودی بالّندەکەمان گرتووە!!

ئێستا کە دەستم لە حەقیقەتی بالّندەکە گیربووە، ئیتر چۆن دەست لەو کۆترە سپییە ئاودامانە هەلّدەگرم، کە دەستم دەگرێت بەرەو خۆر!؟

تۆ ئەو کەسەی لوتفو بەخشندەییت قەشەنگە، تورەیی‌و

سزاشــت بە هەمان شــێوە، هیجران‌و زیزبوونت لە ســەعادەتی هەمــوو دنیــام لا خۆشــترە، ئازاردانــی تــۆم لــە هەنگوین لا شــیرینترە، من شــەیدای هەموو شــتێکی تۆم میهرو توڕەییت، خۆشەویستی‌و ڕقت، تۆ جوانیت، هەموو شتەکانی تۆش لوتکەی جوانیــن، لە جوانەوە جگە لە جوانــی هیچی دی پەیدا نابێت، کەچبینــی چاوەکانە کە هەندێجــار جوانییەکانمان وەکو خۆی نایەتە بەرچاو!

گەیشــتن بە تۆ سەفەری عومرە، ئومێدی ڕۆحە، ئاواتی دڵ‌و تروســکەی ســۆمای چاوە، نزیکی لە تۆ بەهەشــتی نەبڕاوەیە، دووری‌و هیجرانی تۆ وەکو مەحوی دەڵێت: ڕۆژی ڕەشە..

ویـصاڵـت نــارە، هیجرت ڕۆژەڕەش، وەك ئافتابی تۆ
لـە تـۆ نزدیکە پشکۆیە، خـەڵوزە گـەر لـە تـۆ دووربـێ

تۆ هەرچەندە لە هەموو دنیادا تەنها کەسێکی، وەلێ دەکرێت نەزانی کە بۆ تەنها کەسێك، هەموو دونیای!!

دەبــا ئیتر ژەنــگو تەپو تــۆزی دونیاویســتی‌و کەچبینی وەلانێیــن، لە نێو دەریای مەحەببەتدا، ئیتر هەموو شــتێك بە ڕۆح بچێژین‌و ژیانمان بەرزەخێکی نیمچە بەهەشت بێت.

ئــەو کات حوزنی دووری‌و تاســەی دیدار دەبنە ڕوحانییەتی ئەوینێکــی موقــەددەس، ئــەو ئێش‌و ئــازارە لەززەتــی ڕۆحە، پەرژینی پاکیزەیی‌و عەفافە، بە فرمێســکی گەرم‌و بە شەونمی

شــەرمو بە تارای سپی شــکۆداریی نەبێت، گەنجینەی بەهاداری عیشق ناپارێزرێت!!

لاشە مەحرومە، بەڵام ڕۆح ئاسودەو مەسرور!

مەحبــوب بــە نــاری دووری هەڵدەقرچــێ وەکــو پەروانە، دەتوێتەوە وەکو شــەم، بەڵام ســەبرو قەراری بۆ گەیشــتنە بە لیقای ئەبەدی!

شەیدایانی ڕۆح هەمیشە بە دوای نەمریدا دەگەڕێن، عاشقی مردووەکان نابن!

ئــەوان دەزانــن کە گوڵــە ســورە جوانــەکان هەڵدەوەرێن، ڕووخسارە جوانەکان جوانییەکەیان ئاوا دەبێت!

ئیتر ئەوان پێیان شەرمە شەیدای مردووان بن! بۆ ئەوینێکی ئەبەدی دەسوتێن!

بۆ جوانێك کە هەرگیز نامرێت!

بۆ گوڵزارێك کە هەرگیز گوڵاڵەکانی ناوەرێت!

کاتێك دەگەینە ئەو، ئیتر زۆر ئاسانە بگەین بە یەکتر!

ئیتــر ئەگــەر بتوانین بگەین بــە خودا، ئەوا گەیشــتن بە بەندەیەکی خودا ئاسانە!

بەڵام دەبێ لەسەر دووری دونیا ئارام بگرین، تا لە ئاخیرەتدا دیدار ئاخیرەت نەبین!

دەبێت خۆشەویستی ئەویندارى هەمیشە زیندوو "حی لا یموت"

به دەست بهێنین، تا لە "دارالخلد"دا بە یەکتر شادبین!

بـــا لێرە بە دیداری ژێر درەختێـــك ڕازی نەبین، کە خەزان ڕووتـــی دەکاتەوە، تا لە باخەکانی بەهەشـــتدا لە ژێر ســـێوەری دارستانێکدا پشوو بدەین کە هەرگیز دەستی خەزان نایگاتێ!

ئـــەی نابینـــی گەورەتریـــن ئەوینـــدار بە خۆشەویســـترین مەحبوبی خۆی دەفەرموێت: ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ الزمر.

ئەو مەرگە تاڵە، شـــیرینە بۆ کەســـێك کـــە دەیەوێت بگاتە دیداری "مەحبوبی"

هەر بۆیـــە کاتێك لە نێوان مەرگـو ژیانـــدا موخەییەر کرا، ســـەروەرمان مەرگی هەڵبژارد، چـــوون دەیگەیەنێت بە دیداری هەمیشەیی، بە ژووانی نەبڕاوە..

لەوێدا ئیتر دووریو لێکدابڕان بوونی نییە، ئیتر فرمێسکی دووری نارژێت، ئیتر تاســـەی دیدار دڵەکان هەڵناقرچێنێ، ئیتر ئاگری دووری هەناو نابرژێنێ!!

ئیتر کەس بە دەردی جودابییەوە تا سەحەر ناناڵێنێ!

لەوێدا ئەویندارانی ئەوینی نەمر، نەمرییان پێ دەبەخشرێت، چوون ئەوینی ئەوان مەرگ ناتوانێ ڕۆحی بکێشێ، خۆڵ ناتوانێ بیرزێنـــێ، لەگەڵ ڕۆحدا لە شـــەقەی باڵدەداتو فریشـــتەکانی ئاسمان پێشوازی لێدەکەن!

هەربۆیە بیرت دەکەم، بۆنی ئەو خۆڵە دەکەم کە بە گوڵاوی

هەنگاوەکانت موعەتتەر بوون، نیگام هەمیشە لەڕێیە، وشەکانم ناتوانن گوزارش لە هەستی دەروونم بکەن! زمانم ئەو هەستەی پێ هەڵناگیرێ، تا لە حزورتا درکی پێ بکات! هەربۆیە لە بەرامبەرتا ناتوانم هیچ بڵێم، جەستەم وەکو زەمین لەرزە دەلەرزێت، وەلێ ڕۆحم هێمنە، وەکو منداڵێکی نوستوو!

چونکە دەزانم ئێمە دەبێت لەو دەریای میهرو ئەوینە گەورەیەدا بتوێینەوە، تا فرمێسکەکانمان لە هەنگوین شیرینتربن، تا گریانمان پێکەنینی ڕۆح بێت، تا تاسەو چاوەڕوانیمان مایەی خلودی ئەبەدی بێت، چونکە ئێمە ژووانمان "دارالخلد"ە نەك"دارالفنا"، بۆیە لە خوداوەند هەمیشە دەپاڕێینەوە ئارامیمان پێ ببەخشێت، بە میهری خۆی بمانبەخشێو لە هەڵەکانمان ببورێ..............

مەحوی دەڵێت:

سوتانی بە بێدەنگییە ئادابی مەحببەت
وەك بولبول ئەم ئەفغانە بە پەروانە حەرامە!

هەژارێك بە خۆشەویستیو ئەوینی پاشایەکی بەناو بانگ گرفتار بوو، خەبەری عەشقی ئەو گەیشتە پاشا.

پاشاش لەگەڵ بیستنی ئەو خەبەرەدا، بانگی کردو پێی گوت:

ئەگەر تۆ بەڕاستی عاشقی سوڵتانیت، دەبێت یەکێك لەم دووانە هەڵبژێریت:

یا دەبێت ئەم دەڤەرە جێبێڵی، یا دەبێت لەسەری خۆت خۆشبیو بیکەی بە فیدای عەشقو ئەوینی خۆت..!

شا پێی گوت: ئەمە دوایین وتەی منە، یا گەردنی تۆ، یا کۆچ!

ئەو کابرایە شایانی ئەو عیشقە نەبوو، هەر بۆیە کۆچکردنو هیجرانی هەڵبژارد!

هاوکات لەگەڵ خۆئامادەکردنی بابای هەژار، بۆ کۆچکردنو دەستهەلگرتنی لە ئەوینەکەی، شا فەرمانی کرد: سەری لە گەردنی جودا بکەنەوە!

پاسەوان گوتی: قوربان، خۆ ئەو هیچ تاوانێکی نەکردووە، گوناهی چییە، شا فەرمانی سەربڕینی دەدات؟!

سوڵتان گوتی: ئەو ڕاست ناکات، ئەویندار نییە! لە ڕێگای ئەویندا لەگەڵ من ڕاستی نەکرد، ئەگەر وەکو پیاو مامەڵەی کردبا، لەم ڕێگایەدا سەری خۆی دەبەخشی!

هەرکەسێك سەرو گەردنی خۆی لا خۆشەویستر بێت لە مەحبووبەکەی، ئەوا بانگێشەکردن بۆ عیشق، گەورەترین تاوانە بۆ ئەو!

خــۆ ئەگەر ســەربڕینی هەڵبژاردبا، ئەوا دەبووە شــای ئەم مەملەکەتــەو ئــەم هەموو وڵاتــە دەبوونە خزمەتــکاری، تۆش پاسەوان بەشانازییەوە دەبوویتە غوڵامی!!

بەڵام کاتێك ڕاســتی نەکرد لە بانگێشەکەیدا، ئەوا عیلاجی، تەنها جیاکردنەوەی سەرێتی لە لاشەی! چونکە ئەوە ئەو پەڕی نیفاقــە، بــۆ ئەوەش ئــەم کارەم کرد، تا چیــدی کەس بەخۆڕا ئیددیعای عیشقی ئێمە نەکات!!

خۆزگە هەمیشە ئەوینداران، ئاوا تاقی کرابانەوە، گوێیان لە چرپەی ﴿أَنِّي أَذْبَحُكَ﴾ دەبوو، تا بزانین دەیانگوت: ﴿افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ﴾!؟

بۆئــەوەی چیــدی کەس نەتوانێــت بێ گەواهــی بێتە نێو گوڵستانی ئەوین!

مەحوی بە مەحبووبەکەی دەڵێت:

ئێســتا بــۆ لافــو گــەزاف، هــەر کــەس دەبینــی عاشــقە

نــەك هەمــوو کــەس، جانفیــدا، وەك میــمو حــێو واوو یێ!

ئــەوەی لە مانای ئەوین گەیشــتبێ، ڕۆحی شــاباش دەکات، ئەوەی ئەوینداری خۆی ناسی بێت، ئاواتەخوازە بەو ڕۆژە بگات کە ڕۆحی خۆی ببەخشێ لە پێناویدا، ئەو دەیەوێت وەکو پارچە هەورێکی سپی، لەنێو تیشکی خۆردا بتوێتەوە!

ئەویندار وجودی خۆی، لە ئەوینەدارەکەیدا دەبینێت، بەهای خۆی لەو شتەدا دەبینێتەوە کە بۆی دەگەڕا، چەندین ساڵە، عەودالی بوو!

عاریفێك دەڵێت: تۆ ئەو شـــتەی کە بۆی دەگەڕێیت! گەر بۆ ڕۆح دەگەڕێیـــت، تۆ ڕۆحیت! گەر بۆ پاروەو نانێك عەودالی، تۆ تەنها پارووە نانێکی!

تـــۆ بەو ڕۆحە ناژیت کە لە لاشـــەتدا بەند کـــراوە، نا........ مایـــەی زیندەگی تۆ، ڕۆحـــی ئەویندارەکەتە، ئـــەو ڕۆحەی کە هەموو بوونەوەر هەناسەی پێ دەدات!

ئازیـــزم: تـــۆ بۆ مـــن دڵۆپێـــك نیت لـــە دەریایـــەك، بەڵکو دەریایەکیـــت لە دڵۆپێکدا، گوڵێك نیت لـــە باخچەیەکدا، بەڵکو گوڵزارێکیت لە خونچەیەکدا!!

مـــن وەکو ڕۆمـــی دەڵێت: لە بەهەشـــتدا چاوانت دەبینم، لە چاوانیشـــتدا هەموو بەهەشـــت، ئیدی بۆچی تەماشای مانگێکی دی، یا خۆرێکی دی بکەم، ئەوەی من دەیبینم بەسە بۆ من!

بـــێ تـــۆ، من لە دەریـــای بیرچوونـــەوەدا ون ببـــووم، کەس نەیتوانی هەست بە بوونم بکات، تۆ نەبێ، تەنها تۆ!

کەس نەیتوانی بە ناخی مندا ڕۆبچێو بگاتە قووڵایی دڵم، تۆ نە بێ!

کەس نەیتوانی هەموو ڕازو نهێنییەکانم بدرکێنێ، تۆ نەبێ!

کەس ئاگای لە هاواری دڵم نەبوو، تۆ نەبێ!

من کڕیاری ڕۆح بووم بە ڕۆح!!

من ئاشنای وتەکانی ڕۆح بووم، نەوەك کڕیاری وتەکانی زار، هەرچەندە زاری تۆ، شەکرستانو شانەی شەهدە، ئەی کەژاوەی پاکیزەییو عەفاف....!

ده فەرمـــان بدە، بـــا ڕۆژە تاریکەکانم کۆتاییيان پێ بێت، با زەمەنی دووری و بێتۆیی ببڕێتەوە، من بە تاسەی گەیشتنم بە تۆ، ڕۆحم ئەمەی دەوێت، نەك لاشەم!!

مـــن چیدی ناتوانم بێ تـــۆ بژیم، دەکرێـــت بتوانم لە هەموو کەسێك جودا ببمەوە، تەنها لەو کەسە نەبێت، کە لە ناخی خۆیدا، فەرشی وەفای بۆ ڕاخستووم، بە پێڵووی چاوەکانی باوەشێنم دەکات!

هەر بۆیە «نالی» بە خۆڕا بە مەحبووبەی نەدەگوت:

سەر بەردەبازی ڕێتە، تەن تەختە بەندی جـــــێتە

دڵ مەیلی خاکی پێتە، ڕۆح ماڵی خۆتە، بـــــــیبە

ئەو دەیزانی لەگەڵ کێدا دەدوێت، ئەو کەسەی دەیدوێنی بۆ ئەو، واتە چی، ئەمیش بەبێ ئەو چۆن دەبێت، بۆیە لە ناخی دڵییەوە دەیگوت:

بـــەڵا گـــەردانـــی بـــاڵات بـــم ئـــەگـــەر چـــووم

فـــیـــدای هـــیـــنـــدویـــی خـــاڵـــت بـــم ئـــەگـــەر مـــام

دەمـــێـــکـــە وا لـــەســـەر پـــێـــیـــەك دەســـووتـــــــێـــم

لـــە شـــەوقـــی تـــۆ بـــە مـــیـــسلـــی مـــۆم و هـــەرمـــام

ئەویندارى ڕاســـتەقینە دەزانێ: دووری لـــە مەحبووب یانی چـــی! بەڵام من لای کێ باســـی ئەویندارى خـــۆم بکەم؟ کێ لێم تێدەگات؟ کێ دەزانێ من عەودالی چیم!؟

پێـــم دەڵێن: تۆی نەوجەوان بۆچ سەوداســـەری پیرێکی؟ نا، من هەمیشـــە عاشقی ئەو شتانەم کە هەرگیز پیرنابن، بۆ هیچ

جوانێك هەیە پیر بێت؟!

چما ئێوە تا ئێستا جوانێکتان بینیوە؟

بــێ ڕەونەقی ئەو جوانانە، جوانــی ماڵاوایی دەکات، گوڵێك ڕەونەقــی نامێنێت، باخچەیەك بۆی نامێنێت، ســروەیەك ڕوو ناکاتە دڵەکان!

مــن چۆن بێ تۆ بژیم، لەکاتێکــدا تەنها تۆی، بە زمانی من قســە دەکــەی، بە لێوی مــن پێدەکەنی، بە دڵی من خۆشــحاڵ دەبیت، بە چرپەی ڕۆح دێیتە سەما!

حەکیمێك دەڵێت: دووریت لەو کەســەی بە زمانی تۆ قســە دەکات، لاڵییە، ئەگەر هەزار زمانت هەبێت!!

من هەمیشە وەکو مەحوی دەڵێم:

دەرسی عیشقم هەر لە کن پەروانە یا بولبول بووە

بیگەمێ، یا نەیگەمێ، هەر مەشقی ئوستادێ دەکەم!

ئیدی من گوێ بەکەس نادەم، بە هیچ لایەکدا ئاوڕ نادەمەوە، گوێ بە قســەی کەســانێك نادەم کە تا ئێســتا، بۆنی مرۆڤیان نەکردووە، نازانن هاودەمی ڕۆح یانی چی!

منێــك لە دوای عومرێك لە تاســەو چاوەڕوانی، ڕۆحی خۆم بــەدی کرد، منێك کە هێنــدە گەڕام و هێندە چــاوەڕوان بووم، خەریك بوو لە گەیشتن بە تۆ بێهیوا دەبووم.

پێــم وابوو، تا مردن دەبێت تەنها لە تابلۆی خەیاڵدا وێنەت

بکێشم، بۆ هەمیشە، بە تەنێ ڕێگای ئەوین تەی بکەمو سروودو دروود، بۆ خەیاڵ بنێرم!

هەرگیز لەو بڕوایەدا نەبووم، ئەو کەسەی من بۆی عەوداڵم، ڕۆژێك بێت بە پێی خۆی تەشریف بهێنێت..!

فیدای تەشریفی ڕێگەت بێ، خەراجی موڵکی جانو دڵ

نیساری تۆزی بەر پێت بێ، ڕەواجی عومری سەد ساڵم «حەریق»

ئیدی من ڕێگام گرتۆتە بەر، بەرەو لای تۆ، بۆ گەیشـــتن بە تۆ، بۆ گەیشـــتن بە خۆم، ڕێبوارێکی ماندوونەناسم، دڵنیابە من مانـــدوو نابم، چونکە ئەوین ماندووبـــوون نازانێت، لە ئەویندا هەموو شتێك گونجاوە، هەموو شتێك دەشێت ڕوو بدات!

تـــا ئەوین مابـــێ، بێهیوایی وجـــودی نییە، هـــەر بۆیە من، هەرگیز بێ ئەوین ناژیم..

حەکیمێك دەڵێـــت: خۆت فڕێدە نێو ڕووباری ئەوین، ئەگەر ڕووبارێکیش بوو لە خوێن!

بۆ کەسێك کەنرخی تۆ نەزانێت شێتییە ئەم سەودایە، وەلێ من دەزانم گەیشـــتن بە تۆ، واتە: ژیانێکی نوێ، ڕۆحێکی نەمر، عەتایەکی بێسنوور، گەیشتن بە هەموو شت.

من گەر بگەم بە تۆ، هیچم ناوێت!

سەیرە داوای چی بکەم، تەماشای چی بکەم!

من بۆم بکرێت بێ تۆ تەماشا ناکەم، بێ تۆ ناخۆمو ناخۆمەوە!

بێ تۆ پێناکەنم!

من نامۆم تا ئەو کاتەی دەگەم بە تۆ، من لە هەموو لەزەتێك مەحرووم‌م تا دەگەم بـە تۆ، جا کاتێك دەگـەم بە تۆ، ئیدی گەیشتووم بە گەنجینەی هەموو دنیا!!

من گاڵتەم بـەو ئەویندارانە دێت، داواکارییان هەیە لە یەك، داوای مەتاعـی ئـەم دونیا فانییە لەیەك دەکەن، سـەیرە ئەوان مامەڵـەی ڕۆح، بە پـەڕۆو پاتاڵی ئەم دونیایە سـەودا دەکەن!؟ یاخـود ئەوان جگەلە نـاوی ڕۆح، چیدی نازانـن!! بۆیە هەموو خۆشییەکانی خۆیان، تەنها لە خاكو خۆڵی ئەم دونیایەدا دەبینن!

شەوێ لەیلا بە مەجنونی دەوت: بنواڕە حاڵی خۆت
بە خۆڕایی کە چۆنت دا بە با، عەقڵو کەماڵی خۆت
جوابی دایەوە مەجنوون، ئەگەر تاقەت ببێ لەحزێ
لەناو ئاوێنەدا بنواڕە حوسنو جەماڵی خۆت! «مەحوی»

تـا نەگەم بەتۆ کەشـکۆڵو گۆچان دانانێـم، دڵنیام کە هیچ هێزێك ناتوانێت، بەربەستی ڕێگای نوور بێت، ئەوەی من دەیڵێم خەیاڵ نییـە، هەرچەندە هەموو خەیاڵێکیش حەقیقەتی خۆی هەیە، ئەگەر گەورەش بێت هێندەی تۆ!

ماڵاواییت لێناکەم، چونکە ماڵاوایی تەنها بۆ ئەو کەسانەیە کە بە چاویان شـەیدا دەبن، بەڵام ئەوانەی بە ڕۆحو دڵ شەیدا دەبن، هەرگیز جودایی نازانن!! ئەوان لە یەکدا تواونەتەوە!

به هەموو شـــتێکی تۆ ئاشـــنابووم، چاوەکانت بانگیان کردم، نەمتوانـــی نەچم بـــە پیرییانـــەوە، نەمتوانی ئـــەو هەنگاوانە فەرامـــۆش بکەم، کە بۆلای منت نابوون، ئەو هەنگاوانە لای من هەنگاوێکی موقەددەس بوون!

ئەگـــەر بتگوتایـــە بـــە یەکەم دیدار شـــەیدات بـــووم، ئاوڕم نەئەدایەوە، جارێکی دی منت نەدەبینی!

بـــەڵام کاتێك پێتگوتم، مـــن پێش ئەوەی بتبینم شـــەیدات بووم، ئیتر نەمتوانی لە جێی خۆم بجوڵێم، بۆ یەکەمجار بۆنی مرۆڤم کرد، بۆنێکی سەیر!

جازیبەیەکی ســـەیر ڕایدەکێشـــام، بە دەســـت خـــۆم نەبوو، دەهاتمە پێـــشو تۆش خۆت گرمۆڵە دەکرد، ئاخر من دەمبینی چۆن ڕۆحەکان دەستلەملان بوون، چۆن وشەکان سەما دەکەن!

تـــۆ ئاشـــنای ڕۆحم بووی، تۆ ئەو کەســـە بـــووی کە هەموو عومرم بە ڕۆحت لەگەڵم بووی!

تـــۆ بـــە یەك ســـات هەمـــوو بۆچوونەکانی منت گـــۆڕی، بۆ یەکەمجـــار بە ســـۆمایەکی نوێ، جیهانێکی ئەفســـوناویم بینی، حوســـنو جوانییەکی ســـەیر، خەندەیەکی ئـــارام، بۆ یەکەمجار ترسم لە مرۆڤ شکا!

هەســـتم بە گەورەیی پیاوێك کرد کە پێشتر هێندەی هەموو دونیام ڕق لێبوو!

مــن لەوەها مرۆڤێك دەگەڕام، بەڵام بە خەیاڵیش باوەڕم بە وجودی نەبوو!

لــە خــزمــەت ئـاسـمـانـی حـوسـنـی ڕووی تـۆ
سـەمـا (کـەوتـە سـەمـا) گـەردن کـەچـی کـرد
ئـەگـەر وەسـفـت بـە (مـاهـذا بـشـر) کـەم
پـەشـیـمـانـم دەڵـێـم وەسـفـم بـەچـی کـرد! (حـەریـق)

تۆ ئەی شــازادەی ونبووی مەملەکەتی ئەوین، وەکو پروشەی بارانی پایزێکی درەنگ، هیوابارانی هەموو دڵەکانت کرد، جارێکی تر جیهانت بە جوانترین ڕەنگی بەهاری ڕازاندەوە!

ڕەوەیەك بولبولت بە ئاوازێکی سەیر هێنایە خرۆش!

ئەوین قسـە ناکات، بەڵام ئاوازێك دەچرپێــت، وەکو خوڕەی کانیاوێکی هێمن، هەموو کونجو کەلەبەرێکی ڕۆح، دادەپۆشـێت، ئەو ئاوازە سەمفۆنیای ژیانە!

بەستەیەکە ڕۆحە پاکەکان دێنێتە سەما!

من ئەو ئێوارەیە نەمدەویسـت بـڕۆم، چونکە لەو بڕوایەدا بووم، هێندەم تەمەن نەمابێ کە بتوانم بێمەوە حزورت!

ئەگەرچی هەموو عومرم، بەشـی ئەوە ناکات، تێر تەماشای ڕووخسارت بکەم، هەڵاڵەی وتە شیرینەکانت هەڵمژم!

بـە حـەسـرەت عـومـری مـن یـەکـبـارە فـەوتـا
مـەگـەر عـومـرێ دووبـارەم پـێ عـەتـا کـەی! (نـالـی)

ڕۆژێك نەبــوو، مانگێك نەبوو، ســاڵێك نەبوو، عەمرێك لە گــەڕانو عەوداڵبــوون، عومرێك غوربەتو بێکەســی، عومرێك لەســەفەری ڕۆحو ئازاری جەســتەی شــەکەتو ماندووم، بەڵام کە تۆ هاتی ئیتر غوربەت ڕەوییەوە، کەشــکۆڵی ســەفەرم دانا، ڕۆحم لە باوەشــی ئارامیدا ئۆقرەی گرت، تەپو تۆزی ســەفەر بوونە پروشەی گوڵاو، ئەو ئێوارەیە بۆنی نێرگز هەموو کوچەو کۆڵانێکی گرتبووەوە!!

**کــە تــۆ هــاتــی لــە نــائــومــێـدی نــەمــا بــاس**

**لــە هـیـجـرو ئـیـنـتـیـزار ئـیـدی نـەمـا بــاس!** (نــالـی)

ئەو ئێوارەیە ڕۆحەکان گەیشتنەوە بە یەك، هاتبوون تا درێژە بە حەیاتی ڕۆح بدەن، ئەوان دوای دابڕانێکی زۆر، ئەمڕۆ بە دیداری یەکتر شادبوون، ئەوان پێشتر بە نیو ڕۆح دەژیان، بۆ گەیشتن بە کەماڵی ڕۆح، وەکو شەم دەسوتانو وەکو پەروانە هەڵدەقرچان!

ئەو ئێوارەیە فیســتیڤاڵی دوو ڕۆح بوو، کە بە یەك ســۆما دەڕوانن، بە یەك زمان دەدوێن، بە یەك گوێ دەبیستن، بە یەك دڵ ئەوینــداری دەکەن، ئەو ئێوارەیە ڕۆحەکان دەســتی یەکیان گوشــیو تەوقەیان کرد، پێش دەســتو چاوەکان، یەك هەستو نەست، یەك سۆزو ئارەزوو، یەك خەونو حەزو ئاوات..!

ئاخر ڕۆح نامۆیە، ئەگەر لەگەڵ کەســێکدا هەزاران ســاڵ لە ماڵێکیشدا بژی، هەرگیز لەگەڵیدا ئاشنا نابێت، ڕۆژ بە ڕۆژ زێتر

لێی دووردەکەوێتەوە! بەڵکو تا نەگاتە ئەو کەســەی کە هەزاران ســاڵە لە جیهانی ڕۆحدا پێی ئاشــنایە، پێش ئەوەی لاشــەکان خەلق بکرێن!

ئیبنوحەزمی ئەندەلوسی دەڵێت: ئەوین یەکگرتنەوەی پارچەی ڕۆحە بەرزە پەرتبووەکانە، کە لە نێو لاشەکاندا بڵاوبۆتەوە!

ئــەوان ئیدی بــە زمانــی ڕۆح دەدوێن، هەموو ســنورەکان دەسڕنەوە، لە یەکدا دەتوێنەوە، ئیدی منو تۆ وجودی نامێنێت! شــتێك بە نێوی ڕازونهێنی بوونی نامێنێــت! هێندە لە یەکتر دەچــن، ناتوانن پێناســەی خۆیان بکــەن، هەریەکە دەڵێت: من ئەوم، یان ئەو منە، من لەو دەچم، یان ئەو لە من دەچێ!

هــەمــوو تــەمــەنــی ڕۆح گــــەڕانو عــەوداڵــبــوونــە، بە دووی هـاودەمـی ڕاستەقینەیدا، (الأَرْوَاحُ جُنُودٌ مُجَنَّدَةٌ، مَا تَعَارَفَ مِنْهَا ائْتَلَفَ، وَمَا تَنَاكَرَ مِنْهَا اخْتَلَفَ) البخاری ومسلم.

واتە: دڵەکان وەکو لەشکری سەربازان وان، ئەوانەی بە یەکتر ئاشــنا دەبن، هۆگری یەك دەبن، ئەوانەش ئاشنا نابن، جیاوازو ناکۆك دەبن و لێك دووردەکەنەوە!

خەتتابــی لە ڕاڤەی ئــەم فەرموودەیەدا دەڵێت: ڕۆحە پاكو باشو چاکخوازەکان، لێل یەك و خراپەکانیش بە هەمان شــێوە، هــەر ڕۆحەو بۆ هاوشــێوەی خۆی دەگەڕێت، کــە خوداوەند بە سروشت وەهای دروستکردوون!

لەوێــدا ڕۆحــەكان تەنها بە چــاوی دڵ تەماشــا دەكەن، بە ناخــی یەكدا ڕۆدەچن، جوانییەكانی ڕۆح دەبینن، كە خوداوەند هەزاران ساڵە، لە عالەمی ئەرواحدا بەو جوانییەی كە وەكو ڕۆح نەمرە ڕازاندونیەتەوە!

ئــەوان دەچنە خەڵوەتــی ڕۆح، كەس نابینــنو حەز ناكەن كەسیش بیانبینێ، ئەوان لە جیهانی ماددە غافڵ دەبن، هەربۆیە مەولەوی دەڵێت:

ئــاخ پــەی خــەڵـوەتــێ بــدیــام وەبــێ خــەم

ســیــوای تــۆ، دیــــدەم، كــەس نــەدیــام وەچــەم

دڵ پــەی دیــدەنــت كــام خــەڵــوەت ســازۆ

تــۆی دیــدەیــچــم بــی، مــــەردم نــمــازۆ

ئای خۆزگە بە خەڵوەتێك كە لە وێدا جگە لە تۆ كەسم نەدیبا، بە چاوی چاوم! بەڵام وەداخۆ، دڵم شوێنێكی دەستناكەوێت، كە لێیــەوە بڕوانێ بــۆت، جگە لە گلێنەی چــاوم، خۆزگە گلێنەی چاویشــم تۆی نەدەبینیو جگە لە دڵم كەســی تر ئاگای لێمان نەباو كەس ئێمەی نەدیبا!

ئەو دوو ڕۆحە هێندەیان دەردی چاوەڕوانی چەشــتووە، ئەو دڵانە هێندەیان شەوانی تەنیایی بینیوە، هێندە تاسەی گەیشتن بە باوەشــی ئەوین، ناخی هەڵقرچاندوون، دەیانەوێت بگەن بە شادەماری دڵ، هێندە دەردی دووری داخی كردوون، موویەك بە

چیایەك دەبینن، ئەگەر بکەوێتە نێوانیان!

لاشــە هیچ هێزێکی نییە، بەرامبەر بــە ڕۆح، گەر ملکەچی فەرمانی ئەو نەبێت، دەبێتە قەقنەس!

کاتێك ئەو کەسە دەدۆزێتەوە کە پارچەکەی دیکەی ڕۆحی تۆی لایە، ئیتر ناتوانی بێ ئەو بژی، ناتوانی چرکەیەك جێی بهێڵی!

گــەر وابکــەی ئیتر ســاڵانی عــەزابو ئەشــکەنجەو ئازاری دووریو تەنیاییو ســەرگەردانی دەگەڕێتەوە، کەســێك کە وەکو سێبەرەکەت لێت نزیکە، چۆن لە دەستی قوتار دەبیت!

لــە هەموو دونیــادا چی لەوە خۆشــتر هەیە، کە کەســێك بدۆزیتــەوە کــە خوداوەند بۆ تۆی داناوە، کەســێك وەکو خۆت لێت تێدەگات، دەزانێت چیــت دەوێت، ئارەزووی چی دەکەیت؟ خەون بە چییەوە دەبینی! خەیاڵت لە کوێیە؟!

بێ وشــە قســەی لەگەڵ دەکەی، بە زمانــی ڕۆح دەیدوێنی، ئاماژەیەکی ئەو هەزاران ڕستەی ئەرخەوانیت ئاڕاستە دەکات!

لە هەموو ڕازونیازێکت تێدەگات، دێتە ژێر پێڵوی چاوەکانتەوە، شەوانە لە ژێر برژانگەکانتدا دەخەوێت!

ئەو کەسەی کە لە کەس ناچێت، لە نێو هەزاران هەزار کەسدا وێنەی نییە، لە هیچ شــتێك ناچێت، بەڵام هەموو شتە جوانەکان دەیانەوێت، لەو بچن، تۆش دەتەوێت لەو بچیت، تەنها ئەوو بەس!!

ئەو کەسە بە وتەکانی گەرمت دەکاتەوە، لەوپەڕی بێهیواییدا

دەرگای هیوات بۆ واڵادەکات!

دەتگرێتە باوەشـی وشـە شـیرینەکانی، بە ئـاوازی دەنگی مەسـتت دەکات، ئەو کەسـەی وەکو منداڵێکی ساوا، لە باوەشی وشەکانیدا دەچێتە قوڵایی ئارامترین خەو!

تـکای لێ مەکە بۆ تەنها سـاتێك گوێبیسـتی بـیو بەس، ئەو داستانی ئەوینی هەزاران ساڵی لە ناخیدا هەڵگرتووە، ئەگەر هەموو عومرت گوێی بۆ ڕادێری، هێشتا داستانی ئەوین تەواو نابێت!

بێ بوونی ئەو ئەستێرەکانی ئاسمانی تۆ نادرەوشێنەوە! تریفەی مانگەشـەو نابینی! بـێ بۆنی ئەو باران بۆنـی نییە! گوڵ ڕەنگی نییـە! هەنگوین تامی نییـە! پەپولەی خەندەیەك لەسـەر لێوت نانیشێتەوە! بێ ئەو گوڵستان دڕکستانە، بێ ئەو گوڵشەن گوڵخەنە!

بێ ئەو دڵ هەرگیز سوکنایی نایەتو بە ئارامی ئاشنا نابێت!

ئـەو کاتەی ئەوت بینی، دەسـتت هێنا بە هەموو لاشـەتدا، ئەو کاتە هەسـتت کرد، ئێستا گلێنەی چاوت جیهانێکی جیاواز دەبینێ، زمانت وشەگەلێکی سەیر دەدرکێنێ!

گوێچەکەکانت خۆشترین وشە دەژنەفێ، ئەو کاتە خۆتت بۆ یەکەمجار دۆزییەوە!

بـووی بـە دەوڵەمەندترین مرۆڤـی دونیا، ئێسـتا دەتوانی شەوانە سەر بکەیتە سەر خەرمانێك لە یادگاری بەهەشتی!

کەس هێندەی تۆ یادگاری جوانی نین، ئیدی سەرناکەیتە سەر

سەرینێکی بەتاڵ، نا ئیدی لە باوەشی یادگارییە ئەرخەوانییەکانتا خۆشترین خەو دەبینی!

رۆژی وەصڵت هەر سبەینێیە کەوا پڕتەو نەدا
من لە تاریکی شەوی هیجرا ژیانم بۆچییە! (بێخود)

ئەو خۆری ژیانی تۆیە، هەر بۆیە کە ماڵاواییت لێدەکات، وەکو کاتی خۆراوابوون، ئاسمانی ژینت دەبێتە شەوەزەنگ!

خۆئەگەر شەوان تا دەخەوم بە وتەی نێو نامەکانت، چاوم نەڕێژم، ئەوا بینایيم لێڵ دەبن!

تۆ بە هەموو کوچەو کۆڵانێکی دڵمدا ڕەتبووی، جێگەی دەرزییەکی تێدا نەماوە، شوێنەواری تۆی تێدا نەبێت، ئیدی دەتەوێت بۆ کوێ بڕۆم!؟

دەکرێ لە هەور بپرسی بۆ باران دەبارێنی!
لە بەهار بپرسی بۆ هێندە جوانی؟!
لەگوڵ پرسیار بکەی بۆ هێندە بۆت خۆشە؟!
ئەگەرنا، دە ئیتر لێم مەپرسە بۆچی هێندە شەیدای تۆم!؟

ناری دەڵێت:

بە مەولا گەر لە مەولا دڵ بە قوربانت نەبێ نابێ
بە دڵ گەر دڵ موطیعو بەندە فەرمانت نەبێ نابێ
کەسێ مەقصودی کەسبی دەوڵەتی قوربی مەحەببەت بێ
غولامی بۆ غولامانی غولامانت نەبێ نابێ!



# دەتوانی بڕۆی؟

کە تۆ هاتی لەگەڵتا پێکەنین هات

کە ڕۆیشتی هەناسەی ساردو هەیهات

هەمووی هەر هاتوو چوونە کاری دونیا

بە تەنیا هەر خەمە هەردێ ئەگەر هات

ژیلا حسینی

دەتوانــی بڕۆیــیو مەملەکەتــی ئەوین فەرامۆشــکەی؟ گەر دەتوانــی بڕۆی لەگــەڵ خۆتا هەموو پێکەنینــەکان کۆکەرەوەو هەموو نامەکان بپێچــەرەوە، هەموو چرپەکان لە بوخچەیەکدا گرێ بدەو هەموو یادگارییەکان لە گوڵدانێکدا هەڵگرە!

دەتوانــی ئیتــر بۆنی دارمــۆردەکان نەکــەی؟ دەتوانی ئیتر بە ژێر ســێبەری ســپیدارەکاندا گوزەرنەکەیو لە نێو چیمەندا هەرگیز دانەنیشی؟ دەتوانی ئیدی تەماشای خۆراوابوون نەکەی؟ هەرگیز باوەڕناکەم بتوانی!

ئەگــەر دەتەوێت بڕۆی، ئیدی نابێــت بۆنی باران بکەیو لە ژێر پروشــەی باراندا دەستەکانت ڕووەو ئاسمان هەڵبڕی! نا تۆ بێ بۆنی باران ناژیت!

مەگــەر ناوی هەمــوو شــەقامەکان بگۆڕیــت! داری هەموو باخچەکان هەڵکەنیو درەختی نوێیان تێدا بڕوێنی!

مەگــەر بەرگی هەمــوو کتێبەکان بدڕێنی، یــا بە بەرگێکی ڕەش دایانپۆشــیت تــا ئیتر نەتناســنەوە! ئیتر بــە کام ڕێگادا هاموشــۆ دەکــەی... دڵنیام هەمــوو بســتێکی ڕێ لەگەڵت دێنە قســەو پرســیاری ئەوت لێ دەکەن! چونکە هەرگیز بە بێ ئەو نەیانبینیوی!

گــەر دەتەوێت لــە یادی کەی ئیتر دەبێت هەناســە نەدەی، چونکە هەموو هەناســەکانت بۆنی ئەوی گرتــووە! مەگەر لەم

دەڤــەرە كۆچ بكەی! ئەویش بە دزی چۆلەكەی باخچەكەتانەوە! چونكە دوایی هەموو دنیا بە "بۆ كوێ دەچی؟" پردەكەن! ئەوان دەیانزانی بێ ئەو بۆ هیچ شوێنێك ناچیت!

من دەمزانی بێ ئەو ڕێگا دەرناكەیت، تۆ هەمیشــە دەتگوت من لە چاوانی ئەوەوە نەبێت ئەم جیهانەم نەبینی! لە باوەشــی ئەودا نەبێت هەستم بە ئارامی نەكرد!

ئەی تۆ نەبووی دەتگوت:

هەر كە لێم عاجز دەبی توخوا وەرە زوو بمكوژە

چونكە قەتلم خێرە سا ئەم كارە قەت تەئخیر مەكە «كوردی»

من كوێم هەیە بۆی بڕۆم، من لەگەڵ ئەودا نەبێت هەست بە بوونی خوودی خۆشم ناكەم، چەندین ساڵە لە پەراوێزی ژیاندا، بە خودی خۆشم ئاشنا نەبووم، تەنها ئەوبوو توانی بە هەموو گەردوونم ئاشنا بكات، بێ وجوودی ئەو من بە هەموو شتێك ئەغیار دەبم:

هــەتــا تــۆم ئــاشــنــا بــووی، ئــاشــنــا بــووم

ئەمێستا مــوو بــە مــووم ئــەغــیــارە بــێ تۆ «نالی»

من لە دووری ئەو، هەموو جیهانم بە چۆڵی دێتە پێش چاو، چونكە كەس لە زمانی من حاڵی نەبوو ئەو نەبێ! چونكە لەم دنیایەدا تەنها دوو كەس دەتوانن گوێت لێ بگرنو لە هەموو وشەكانت حاڵی ببن، كەسێك كە وەكو تۆ هەمان ئازارو ناڕەحەتی چەشتووە، یا كەسێك كە تۆ بۆ ئەو هەموو شتێكیت!

كە تۆ هەردووكیـــان بوويت، تۆش وەكو من عەودالّ بوويت، وەكو من وێڵ بوويت، بە شـــوێن ناســـنامەی خۆتـــدا دەگەڕای، تـــۆش ماندوو بووی، تەنيايی گڕی لە ناخت بەردابوو، نەتتوانی بە هيچ ڕووخســـارێك ئاشـــنا بيت، ڕۆحی شەكەتت بۆ سێبەری بالآيەك دەگەڕا!

ئيـــدی من ناڕۆم، من هێشـــتا نامەی دڵم بـــە تەواوی عەرز نەكـــردووی، مـــن دەمەوێـــت هەموو شـــتێكت بۆ بـــاس بكەم، هەمـــوو ئەســـرارێكی دڵم والآكەم، من چيـــدی ناتوانم بە تەنيا لـــە چاوەڕوانيتا بوەســـتم، من ئيدی بەرگەی بـــێ تۆيی ناگرم، تۆ خۆری ئاســـمانی هەموو هيواكانی منی، من تەنها هەست بە وجوودت ناكەم، بەڵكو هەســـتكردن بە غيابی تۆ لە هەستكردن بە وجوودت گەورەترە!

من لەگەڵ تۆدا لە هەموو شـــتێكەوە نزيكم، تەنانەت هەست دەكەم لەگەڵ تۆدا لە خوداوەنديشەوە نزيكم، وەلێ دوور لە تۆ باڵندەيەكی نابەدڵم لە ئاسمانێكی ڕەشو تاريكا!!

خـــۆش ئـــەو يـــارەی شـــەريكی كـــاتودەم بێ
لـــە شـــەوگـــاری درێـــژا نـــووری شـــەم بێ
دژی ڕۆژگـــاری چـــەوتو تـــووشو نـــاخۆش
بـــۆ خـــاتـــوو زيـــنـــی دڵ، ئـــەو كـــاكـــەمـــەم بێ

«ژيلا حسينی»

دەزانــم لێم زیزیت، بەڵام زیزبوونی تــۆ، زیزبوونی هەموو شــتەکانە، ئەو کاتەی تۆ دەڕۆیت لەگــەڵ خۆتا ژیان دەبەیتو هەمــوو جوانییــەکان دەپێچیتــەوە، تەنها فرمێســکو گریانو خەمێکی قوڵ نەبێت، هیچم بۆ جێناهێڵی!

پەنجەرەکەم دەخەمە ســەر پشت، بەڵام تیشکی خۆر نایەتە ژووریٚ، چۆلەکــەکان لەبەردەمــی پەنجەرەکەمــدا ناجریوێنن باوەشــم دەکەمەوە بۆ پروشــەی باران، بەڵام ئەوان پشــتم تیٚ دەکەن، مۆمی ژوورەکەم بە ئاستەم تروسکەیەکی تێدا دەمێنێت، کە تۆ دەڕۆی من جگە لە ڕەنگی ڕەش ڕەنگێکی تر نابینم..!

پێم دەڵێن تۆ گۆڕاوی! ئەوان نازانن هەموو گەردوون گۆڕاوە!

پێم دەڵێن: بۆ قســە ناکەی وەکو جــاران؟ نازانن من زمانم نییە بیٚ ئەو، چی بڵێم؟ باسی چییان بۆ بکەم؟

لێوی وشــکو ڕەنگی زەردو دڵی شــکاوو دیدەی بیٚ نور چی بکەن بیٚ تیشکی خۆری تۆ؟!

عیللەتی بیٚ ئیلتیفاتی تۆیە ناڵەی سۆزشم

باعیسی شەرمی گوڵە، بولبول، کەوا زاری دەکا «کوردی»

تۆ دەزانیت ئەو شــەوانە چەند سەختە کە بە تەنیاییو بیٚ تۆیی بەسەریان دەبەم؟ چەند سەختن ئەو ساتانەی بۆ باوەشی پڕ میهرو ئەوینت دەگەڕێم..! دەمەوێت بگەمە شــادەماری دڵت،

دەزانی تاسەی تۆ چۆن ئەشکەنجەم دەدا؟ بە شەوانە بە چی ئازارێکەوە دەتلێمەوە؟

شەوانە هێندە پەیامەکانی تۆ دەخوێنمەوە، خەریکە ئاوی چاوم دادێت؟

هێندە دەگریم خەریکە سۆمای چاوم لێڵ دەبێت!

تاسەی دووریت ڕۆحم ئازار دەدات!

ئەشکی حەسرەت لازمی جەمعی سیابەختانە هەر

شەونمی سوبحە دەلیلی قەترەیەك گریانی شەو «شێخ نوری»

ئاخر تۆ ڕابەری ژینو مانی منی، تەنها تۆ دەتوانی دەستم بگری بەرەو لێواری دڵنیایی!

من بێ تۆ وڵاتێکی بێ ئاڵا، نیشتمانێکی بێ ئازادیم، باخچەیەکی بێ گوڵم، بولبولێکی بێ لانەم، تا ئێستا نازانم من بێ تۆ چی بووم؟ تا بزانم دوای تۆ دەبم بە چی؟!

تۆ لە تاریکترین شەوی دەیجوردا گڕی چرایەکی پرشنگداری بۆ من، لە وەرزی کڕێوەو شەختەو سەهۆڵبەنداندا ئاوازی دەنگت گەرمم دەکاتەوەو لەوپەڕی بێ کەسیو تەنیاییدا وتەی لێوەکانت دەمگرنە باوەش، بۆیە هەمیشە وەکو شێت خۆم لە باوەشی وشەکانتا دەبینمەوە!

من تەمەنێکم لە ڕۆژگاری ڕەشو پڕ لە ئازار بردە سەر، دەتەوێت جارێکی دی بگەڕێمەوە ئەو دۆزەخە؟

ڕەش‌و تارو درێژو پڕ لە ئازارو خەم‌و دەردە

بەڵێ شەوگاری دووری بوو سەراسەر ژینی تاڵی من «هێمن»

نا من تۆ چاك دەناسم، هەرگیز ئەم هەوارە خاڵی ناكەی!
چرای ئەم ژوانە خامۆش ناكەی ڕازی نابیت جارێكی دی خەندە لێوەكانم جێبێڵێ، گوڵی هیواكانم هەڵوەرێن..

تۆ ئەستێرەی ئاسمانی منی، تۆ بوخچەی ڕازو نهێنی‌و حەزو ئاواتەكانی منی!

هەمیشە چاوەڕوانی هاتنی تۆم، گوێم بۆ دەنگی هەنگاوەكانت شل كردووە!

سەرنجی ڕێ ئەدەم، ڕێگا، هەمووشێوەی ئەوی تیایە

وەكو دونیا لە ناو جوانی ئەوا توابێتەوە ..... وایە «هەردی»

چاوەڕوانم، دەرگاكەم خستۆتە سەرپشت، پەردەی ژوورەكەم لاداوە، دەزانم لەگەڵ هەورەكاندا دێیت، تا تێر بە ئاوی باران خۆت نەشۆری‌و بۆنی باران نەگریت نایەی بۆ لام!

ئەوكاتەی كە تۆ دێیت هەموو باخچەكان خۆیان دەگۆڕن بۆ پێشوازی، دەزانن تۆ بە تەنیا نایەی، هاودەمت بارانە!

هەموو ئەم شارە بۆنی تۆ دەگرێ، لە پەنجەرەكەوە بۆنی باران موژدەی هاتنی تۆم بۆ دێنێ.....

چونكە دەزانێ كە تۆ هاتی ئیتر جگە لە بۆنی تۆ لە جیهانی مندا بۆنێكی دی وجودی نیە!

دە وەرە، تا بزانی چی مەراسیمێکم بۆ لیقای تۆ ڕێکخستووە، تــا بزانی ئەو ئەوینەی ڕۆژانە بە بارانی فرمێســك دەشــۆرێت هەمیشە بە پاکیو نەمری دەمێنێتەوە!

وەرەو تا بزانی من ئەوینی تۆ بە هەموو دونیا ناگۆڕمەوە!

وەرەو تــا بزانی هەموو شــتێ: لە خۆشەویســتی بێهێزترە، ئەگەر ژیان لە مەرگ بترسێ، ئەوا مەرگ شەرم لە خۆشەویستیو ئەوین دەکات!

ئەویــن گەورەتریــن گەنجینــەی خودایــە، لــە دڵــە پاكو بێگەردەکاندا نەبێت هەرگیز جێگای نابێتەوە!

تــۆ تەنهــا تکای منــی لە کــردگار، گەر خوداوەنــد تۆم پێ ببەخشێ، ئیدی من داوایەکم نامێنێ لەم دونیایەدا:

من دڵنیام تۆ ســـروەی فیردەوسو میوەی بەهەشــتو ڕازی دڵو هێزی ڕۆحو شەونمی میهرو لوتفی خودایيت، تۆ سوکناییو ئۆخژنی گیانو ئاواتی عومری...

هەرچەندە کە ئینسانە لەبەرچاوی منو تۆ

مومکین نییە ئەم لوتفە لە ئینسانو بەشەردا

«نالی»

دووریــت لێــوم هەڵدەقرچێنیو گــەروم دەتاســێنیو ناخم هەڵدەپروکێنــیو گڕ لــە دڵو دەروونم بــەردەدا، لە باخەوانی گوڵستانەوە دەمکاتە ڕەنجەڕۆی ڕەزێکی سوتاو!

دەردی بــێ تۆیی بە نێو شــادەمارەکانی دڵمدا ڕۆدەچیو لە دەریای ئازاردا نوقمم دەکات، شــەوانە جگە لە فرمێسکی گەرمو هەناســەی ســاردو ئاهی جەرگبڕ، هیچ هاودەمێکــی دیم نین، غوربەتێکی تاڵ دەســتدەخاتە گــەرومو هەورێکی ڕەش بینایم لێڵ دەکات!

میوانــی دیوەخانی دڵــم جگە لە حەزرەتی خەم کەســی دی نییە! ئەگەر گریانو ناڵەی نیوەشــەو نەبا، ئەوا هەرگیز دەســتی لە یەخەم بەر نەدەدا:

شەوانە گەر نەکەم ئەو شیوەنو ناڵینو گریانە
دەسوتێنێ وجوودم ئاگری ئەم جەرگە بریانە
بەڵێ گریانی نیوەی شەو، دەکا ناسۆری دڵ، مەرهەم
کوڵوکۆم دادەمرکێنیو بەجێدێڵێ دڵی من خەم «هێمن»

بۆ دووری لەو کەسەی کە تیایدا تواویتەوەو ئیدی بێ وجودی ئەو هەست بە وجودی خۆت ناکەیت، گریان کەمترین مەراسیمی حوزنو خەمو ئازاری ڕۆحە.. چونکە ئەو کاتەی لێت دووردەکەوێتەوە ئیدی لەگەڵ خۆیدا هەناسەکانت دەباو توانای هەناسەدانیشت نامێنێ بێ ئەو، لاشەت بە نیوەڕۆحێك زیندەگی

دەكاو مردن بە ئاوات دەخوازێ، نەك سزای سەختی دووریو هیجران!

بێــرۆو بمكــوژە، لــە لای تــۆ مــردن

نــەوەك بە بــێ تۆ ژین بەســەربردن!! «سەعدی شیرازی»

هــەر بۆیە شــەوانە زامی فیراقو دووری تــۆ خەوی پێڵوی چاوەكانم دەتۆرێنێو وەكو لرفەی شالآوی ئاگرێك كە لە پوشو پەلاشی وشك ئالآبێت سینەم لە ناخەوە هەڵدەقرچێنێ، چونكە هەموو چركەیەكی مەرگەساتەو هەموو هەناسەیەك حەسرەت!

ئەو كەسەی بە هاودەمی ڕاستەقینەی ڕۆحی خۆی گەیشتبێ، بــە دوانەی گیانو لانــەی ئەوینو باوەشــی حەوانەوەی ڕۆحی ئاشــنا بووبێت، ئیتــر ناتوانێ بە تەنیا بژی! ئەو كەســەی بە دیداری ڕۆح شادبووبێت، مەحاڵە بتوانێ ساتێك ئۆقرە بگرێ!

هەركەسێ شەهدی ویصاڵو ژەهری دووری چەشتبێ

ئەو دەزانێ دەردی دووری چەند گرانو زەحمەتە!! «كوردی»

ژیان بێ نوری دیدەو ســۆمای چاوو هێزی ئەژنۆو ڕازی دڵو سروەی ڕۆح، دەبێت چۆن ژیانێك بێت؟!

بۆیــە هەرگیــز دڵ لــە شــەكواو ســكالآو دەردو زاری خۆی ناكەوێت، بێ دیداری یار بە هیچ شتێكی دی سوكنایی نایەت!

دڵ لەبــەر زامــی فیراقــت، دائیمــا زاری دەكا

ڕۆژو شەو مەنعی دەكەم باز، دەردی سەختە ناسرەوێ «كوردی»

شەوانی تەنیاییو بێداریو دانیشتن بە دەوری ئاگردانی یادگارییەکانەوە، بۆ ئەوەی بڕێك ناخی ڕچیومان گەرمکەنەوە ساتەوەختێکی سەختو دژوارن!

مرۆڤ لەسەر نەخشەی زەمین لە نێو ئەم هەموو خەڵکەدا خۆی بە تەنیای تەنیا دەبینێ! شتێك نییە وابەستەی بکات بە گەردوونەوە جگە لە ئەویندارەکەی! ئاخر ئەو تەنهاکەسە کە لە زمانی ئەم حاڵی دەبێت هەست بە بوونی دەکات! لە باوەشیدا دەگاتە لوتکەی دڵنیاییو بۆنی ڕاستگۆییو پاکیو وەفاداریو خۆشەویستی کەیلی دەکات!

ئەو کاتەی مرۆڤ لەگەڵ ئەویندارەکەیدا هیچ جیاوازییەك ناهێڵێو هەموو شتەکان بە یەکسانی دابەش دەکات جوانی، تەمەن، هەست، ئاوات، ئارەزوو، ئیتر ئەوان وەك گوڵاوی دوو گوڵ ئاوێتەی یەك دەبن، ئیتر دەبنە یەك مرۆڤ، یەك کەس لە هەموو شتێکدا، هیچ جیاوازییەك نابینن، بەڵام ئەم ڕاستییە تەنها چاوی ئەویندارەکان دەتوانن بیبینن!

کەسانی دی لەمە حاڵی نابن!!

حافزی شیرازی دەڵێت:

سەیرە، لەگەڵ وجودی تۆدا وجودی من بمێنێ، سەیرە کاتێك تۆ هاتیتە گوفتار ئیدی من بتوانم وتەیەك بدرکێنم!

دڵی من مۆمو ڕووی تۆ هەروەکو شەم

ئەتاوێتۆ لەبەر پێتا ئەبێ جەم

ئەوا ئێستا دەسوتم تا بزانی

کە عەشقی تۆ چرایەو من پەپولەم «کۆلیل»

لە ئەویندا تەنها ئەویندار بە چاوی دڵی هەموو شتێك دەبینێت، چونکە چاوی ئاسایی هەرگیز توانای بینینی جوانییە حەقیقییەکانی نییە!

هەربۆیە ئەوانەی جگە لە چاوی سەر بیناییەکی تریان نییە لە بینینی جوانییەکان مەحرومن!

بە دیدی دڵە، ئەویندار دەگاتە کەماڵی بەشەری!

ڕۆحی دەگاتە لوتکەی بەرزیو خۆشەویستیو فڕین بەرەو ئاسمانی عیشق!

گڕی ئەوین وەکو ئەو ئاگرەی ئاڵتونی پێ زاخاو دەکەن مرۆڤەکان لە هەموو عەیبو عارێکی فوڕینی پاك دەکاتەوەو لە جیهانی ڕۆحدا تارای فریشتەیان دەکاتە بەر!

بۆیە ئەویندار تا نەتوێتەوە وەکو مۆم، نەسوتێت وەکو پەروانە، ناگاتە حەقیقەتی ژیانو لەزەتی ڕۆح!

بۆیە عاشقانی ڕاستەقینە ڕۆژانە هەزاران جار دەمرن، بەڵام چونکە ئەوان تەنها مامەڵە لەگەڵ ڕۆحدا دەکەن، لەبەر ئەوە هەر دەژین! دوای هەموو مردنێك ژیانێکی نوێیان پێ دەبەخشرێ!

ژیانێـــك دوور له دونیاپەرســـتیو ماددەویســـتیو شـــاوەتو ئارەزووبازی!

ئەوان وەکو نور له نێو دەزووله خوێنینەکاندا دێنو دەچن!

دوور لـــەو ئەوینـــە ژیان تاریکســـتانو دەیجـــورەو بوون بێ مانایەو وجود بێ ئیعتیبارە!

ئـــەوەی جارێك بۆنی میســـکی عاشـــقانی کردبێت! ئەوســـا دەزانێت که ژیان بێ ئەوین جگه له دۆزەخ هیچی دی نییه!

بێ نوری تۆ من بەرپێیەکانی خۆم نابینم! بێ سیمای حوسنی تـــۆ، پەیڤێك نادرکێنم، تۆ هەموو جوانییەکانی منت والآکردوو هەموو عەیبەکانمت داپۆشـــی! تۆ تینوێتی ڕۆحت شـــکاندمو به خۆشترین سرودی ئەم سروشتەت ئاشنا کردم!

ڕۆمی دەڵێت: کاتێك بۆ یەکەمجار هەستم به ئەوین کرد بۆ تۆ گەڕام، من کوێر بووم نەمزانی که عاشقەکان هەرگیز یەکتر نابینن، چونکه هەریەکەیان بۆ هەمیشه له نێو ڕۆحی ئەوی دیدا دەژی!

سەعدی شیرازی دەڵێت:

قال لی المحبوب لما زرته    من ببابی؟ قلت بالباب أنا

قال لی:اخطات تعریف الهوی    حینما فرقت فیه بیننا

و مضی عـام فلما جئته    اطـرق الباب علیه موهنا

قال لی:من أنت؟ قلت:انظرفما    ثـــم الا انت بالبـــاب هنـــا

قال لی: احسنت تعریف الهوی    وعرفت الحب فادخل یا أنا *

بەڵــێ لە ئەوینا منو تۆ وجودی نییە، جگە لە یەك وجود، بوونی نییە! هەر کەســێکیش تامــی ئەوینی نەکردبێو بەگڕی ئاوری ئەو نەســوتابێ، لە خــۆڕا دەژی، چونکە ژیان بێ ئەوین هیچ تامو مانایەکی نییە، هەربۆیە حەمدی ساحێبقران دەڵێت:

زمـانـم شـەق ئەبا یـەکـدەم ئـەگـەر بێتو نەبا نـاوت
بە کوێری دادەنیشم گـەر لەبەر چـاوم نەبێ چاوت
لەبەر تەشریفی ڕێگەی تۆ نەبێ بۆچیمە نـوری چاو
ســەرم لازم نـیـیـە، لازم نـەکـا بینێمە پـێـنـاوت!!

گەر لێم بپرســی تۆ ئەم هەمــوو عەیامە لە کوێ بووی؟ لە وەڵاما دەڵێم من هیچم بیرنایەت! شتێك لە ژیانمدا نییە شایانی باسکردن بێت! ئەوەندە دەزانم من لە جیهانی لە بیرچوونەوەدا نوقــم بووبووم، من خۆم هەســتم بە بوونــی خۆم نەدەکرد، چ جــای ئەوەی هەســت بە بوونم بکرێت! ژیانــی من لەو ڕۆژەوە دەست پێدەکات کە تۆم ناسی!!

مــن دەزانم ڕێــگای ئەوین دڕکڕێژە بە خەمو پــەژارەو ئازارو تاســەو چاوەڕوانیو ئەشــکەنجەو عەزابــی ڕۆحو هەڵقرچانی دڵ، وەلێ ئەم ڕێگایە هێندە گەورەیە، ئەم ئامانجە هێندە بەرزە، هێندە پاکە، هێندە نەمرە کە شایانی هەموو قوربانیدانێکە... بۆ گەیشتن بە ســەرچاوەی نور بۆ گەیشــتن بە دەریــای ماریفەتی حەقیقی، هەموو ماندووبوونێك دەبێتە مایەی سەمای ڕۆحو لەزەتی گیان!

ئەم ژیانە کورتە دیارییەکی بچکۆلەیەو بە شەرمەوە پێشکەش بەو ئەویندارە دەکرێت کە ئەگەر ئەو نەبا، نە خۆر تیشکی دەباو نە گوڵ بۆنی دەباو نە خەندەیەك دەکەوتە سەرلێو!

شەوانی تەنیاییو حەسرەتو چاوەڕوانی تاریكو درێژو نەبڕاوەن، فرمێسکی گەرمو ناڵەی نیوەشەوو ژانی هیجرانو هەناسەی سارد گەڵای تەمەن هەڵدەوەرێنیو ڕەنگی زەردو خەمێکی قوڵو سیمایەکی خەمبار بە ڕووخساری ئەوینداران دەبەخشێ، وەلێ ئەمە باجی ژیانی ڕۆحو ئارامی ناخەو سوتەمەنی عیشقە!

بە شوعلەی عیشقی پرتاوی وەها شێواوو سووتاوم
لە جەرگم خوێن دەبارێتو لە چاوم ئەشکی بێدوایی
کە دڵبەر پێکەنی زوو دڵ بەری گرتو وتی یاران
گەلێکم خوێن ڕژا هیچ کەس بە هیچ نابێ لە خۆڕایی
مەڕەنجێ تۆ برەنجی گەنجی ڕەنجی من بەبا دەڕوا
دەبێ چەشنی هەتیو بگریم لە پاڵ دیواری تەنیایی
سروشتی دوونە گەر دوون، گەر دڵت ڕۆحم نەلاوێنێ
گوڵی عومرم دەژاکێنێ، خەمو ئازاری ڕاڕایی!
(کوردۆ)

وەلێ لە هەمووی سەختتر ئەوەیە کە هەرگیز ناتوانین بە زمان گوزارش لە ئەوین بکەین، جگە لە خودی خۆمان پێشانی کەسی دی بدەین! خەتا لە ئێمە نییە، خۆ ئەگەر

دونیا هەمووی نوقمی نوربێت، ئەوا کەس ناتوانێت ئەو نورە ببینێت، ئەگەر نور لە نێو دڵیدا بوونی نەبێت!

جوانتریـــن گوزارش لە ئەوین بێدەنگییە، هیچ شـــتێك وەکو بێدەنگی گوزارش لە ئەوین ناکات، چونکە ئەو کاتەی ڕۆحەکان ئاوێزانـــی یـــەك دەبنو لێل یـــەکا دەتوێنەوە، ئیتـــر بێدەنگیو ئارامی جیهان دادەپۆشێت!

تۆ ناتوانی وشـــەیەك بدرکێنی، خۆ ئەگەر هەموو ڕازو نیازو ئەســـراری دڵت والأکەی جگە لە ئەویندارەکەت کەس لە زمانی تۆ حاڵی نابێت، چونکە تۆ بە زمانی ئەڤین دەدوێی!

تێگەیشـــتن لەو زمانەش بۆ کەســـێك کە ســـوتاوی تـــاوی ئەوین نەبێـــت ئەســـتەمە!! جا بۆ ئەوەی لە زمانی ئێمـــە حاڵی بنو لێمان تێبگەن دەبێت هەوڵبدەین نوری عیشق بگەیەنینە دڵەکانیان، دەبێت لە زەلکاوی دنیاویستیو کەچبینی وەدەریانبێنینو بە جیهانی ڕۆحو بینینی حەقیقەتی جوانیو خۆشەویستی ڕاستەقینە ئاشنایان بکەین!

مەولانای ڕۆمی دەڵێت: چیت هەڵگرتووە بۆ مەنزڵی عیشـــق، هەموو شتومەكو کاڵاکانت دانێ! ئەوانە هیچی لەوێ ڕەواجیان نییە، تەنها دڵێکی پاكو ئەوینێکی ڕاستەقینە نەبێ، لەوێ دەرگا بۆ هیچ ناکرێتەوە!

بۆ گەیشـــتن بەو مەنزڵە وچان نادەیـــن، لەوێدا گەردیلەکان دەبن بە خۆری ڕووناکی، گوڵەکان دەبنە گوڵزار، دڵۆپەکان دەبنە

دەریایەك لە میسكو گوڵاو....

ئەویـــن ژیانێکی نەبڕاوەیـــە، بێ کۆتایـــی... چونکە ئەوینی ڕاستەقینە هەرگیز کۆتایی نایە!

بە فرمێســـکەکانی ئێمە دەریای ئەویـــن گوڵاوپڕژێن دەبێت، بەگـــڕی دڵی ئێمە چراخانی ئەوین وەکو گڕی خۆر هەموو دڵە شەیداکان ڕووناك دەکاتەوە!

وتەکانی من بە گلەییو سکاڵاو بێزاری تێنەگەی، من هەموو عومرم دەبەخشم بەهەستێکی پاكو ڕاستو بە دڵێك کە باوەشم بۆ دەکاتـــەوەو لە ناخیدا دەمپارێزێو بە چاوێك کە هەمیشـــە ئاگای لێمەو کاتێك تەماشای دەکەم هەستم پێ دەکات!

من فیدای ئەو کەســـەم کە ڕۆژانە هەواڵم دەپرســـێو هەرگیز لێم هەراسان نابێت، ئەو کەسەی هەموو بەختەوەری خۆی بە من سپاردووە!

دڵنیابـــە دەســـتەکان ناگەنـــە ئاســـمان، بەڵام بـــۆ دڵە پاكو ســـپییەکان زۆر ئاســـانە ڕۆژانە بە دەوری عەرشی کردگارا وەکو پەروانە بخولێنەوە!

ئەو خوداوەندەش کە ڕۆژانە هەزاران خۆزگەو ئاوات بەدیدێنێ، زۆر ئاسانە ئاواتی ئێمەش خۆزگەی بەدیهاتووی یەکێك لەو ڕۆژانە بێت!

---

* دەڵێـــن ئـــەم چەند بەیتـــەی حافزی شـــیرازی بە هەمـــوو زمانە جیهانیەکان لەســـەر دیواری کتێبخانەی کۆنگرێســـی ئەمریکی نوســـراوە، منیش وەرم نەگێڕا بۆ کوردی تا خۆتان لە ماناکەی تێ بگەنو چێژ لەو مانا بەرزەی حافز وەربگرن کە لە تاریفی خۆشەویستیدا گوتویەتی!

دەگێڕنەوە پاشـــایەك مەجنونی بانگ کـــردو پێی گوت: ئەوە تۆ چیت بەســـەرهاتووە، بۆچی خۆت ئاوا پەرێشان کردووە، وێڵی دەشتو کێوانیو نەفسی خۆت بە هیلاك بردووە! لەیلا چییە تۆ هێندە بۆی ســـوتاوی! ئەو کچە ئـــەوە ناهێنێت تۆ ئاوا خۆتی بۆ بکوژی!

وەرە با جوانانی بێ وێنەت پێ نیشـــاندەم، تا بزانی جوانیو قەشەنگی ئەمان لە کوێو جوانی لەیلێ لە کوێ!

بـــەڵام کاتێك جوانان هاتنە مەجلیســـی شـــا، مەجنون ســـەری داخســـتو پێڵوی چاوەکانی لێکناو بە هیچ شـــێوەیەك تەماشـــای نەکردن!

پاشا گوتی: سەر هەڵبڕەو تەماشا بکە، بزانە چی جوانییەك دەبینـــی، ئەمانەت هەموو پێدەبەخشـــم، ئیتـــر چیت لە لەیلێ داوە؟ بۆچی سەرهەڵنابڕی؟

مەجنون گوتی: قوربان دەترسم ئەگەر سەرم بڵندکەم ئەوینی لەیلا شمشێری خۆی هەڵکێشێو سەرم لە گەردنم جودا بکاتەوە! من دوای لەیلا تەماشای کەسێکی دی چۆن دەکەم؟!

بۆیە هێدی شاعیر دەڵێت:

زوڵفـی سـەرشـانـت عـەزیـزم! کـاتـێ هـاتـی شانەکەی
من گوتم سـەد خۆزگە دەنکی شانەبامو شـا، نەبام!

بۆ کەسێك تەنها ئەوین لە جوانیو سیمادا ببینێت ئەستەمە بتوانی بە زمانی عیشق لەگەڵی بدوێیو ئەویش لێت حاڵی بێت،

ئــەو کاتە نازانی چۆن وای لێ بکەیت هەســت بە هێزی ئەوین بکات، بزانێت نوری ئەوین تیشکێکی موعەتتەرە، بۆنی ڕۆحەکان کەیلەکاتو نوریشی سۆماکان بە ناخی ئەوین ئاشنا دەکات!

ئەو کات ناچار دەبین ماتو بێدەنگ بین، پەنا بۆ ئەندێشەو خەیاڵ بەرین!

مــن چۆن پێیــان بڵێم کە دڵێك هەیە گوێی لە گریانی منە، هەرچەندە من بە بێ دەنگیش بگریم!

ئــەو دڵــە هەناســەکانم دەژمێرێ، لەگــەڵ هەمــوو هەنگاوەکانمدا هاودەمە، چۆن پێتان بڵێم: ئەو دڵە سپییە وەکو بەفر، پاکە وەکو باران!

ئاخر من چۆن پێتان بڵێم خۆشەویســت ئەو کەســە نییە کە دوای مردن تێر بۆت بگری! مەراسیمی شینو گریانت بۆ ساز بکات!

نا ئەو کەســە بەڕاستی خۆشــیدەوێیت کە دەمرێ، دەسوتێ، کاتێك دەبینێ تۆ دەگری!!

**مەولانای ڕۆمی دەڵێت: ئەگەر ئەوینو خۆشەویستی بچێتە نێو ناخی کێوەکان، ئەوا دەهەژێنو لە خۆشیدا دەکەونە سەما!**

دەزانم بێدەنگی سەختە، بەڵام لای ئەوینداران بێدەنگی هونەرە، چونکە ئەوان زەمەنێکە دەسوتێن، هەڵدەقرچێن... وەلێ بێدەنگ!

خۆ ئــەوان گڕی ئەوینێك دڵــی هەڵنەپڕوکاندوون، تا وەکو دەریایەکــی مەنگ گوێت بــۆ ڕادێرنو تۆش بە ئەســپاییو بە زمانــی چرپە پێیان بڵێی: ئاخر من مرۆڤێکم خۆشــدەوێت کە ئــەو لە چاوی مندا هەمــوو گەردوونە بەڕەنگــی ئەرخەوانی!

ئەو زەوی‌و ئاسـمانی منە، لانەی بەختەوەری‌و باوەشـی میهرو ئۆخژنی دڵمە، ژووانی ڕۆح‌و سۆمای چاومە!

ئـەوان ئۆقـرە ناگرن تا پێیـان بڵێی: کە ئەویـن گاڵتە بە هەموو باق‌و بریق‌و پلەو پایەو سـەروەت‌و سامانی دونیا دەکات، چونکـە هەموو ئەمانە بێ خۆشەویسـتی ئەرزشـیان نامێنێ‌و هەموو لەزەت‌و خۆشییەك لە دەست دەدەن!

تۆ پێویستت بە کەسێك نەبوو گوێ بۆ قسەکانت ڕادێری! تۆ تەنها دڵێکت دەویست هەست بە سەداو زایەڵەی ناخت بکات!

ئەڵئـان ئەو دڵە گوێی بۆ لێدانی دڵت ڕاگرتووە، تا گوێی لە دەنگی هەناسەت نەبێت، دڵنیا نییە کە هێشتا دەژی!

ئێسـتا تۆ لە نێو ئەو دڵەدا ڕەشـماڵت هەڵداوە کە عومرێکە بە شوێنیدا وێڵی!

ئەو دڵە ساتێك لە دووری تۆ ئۆقرە ناگرێت، سروەی نەسیمی بۆنی گوڵاوی تۆ نەبێت دەبێتە قەقنەس!!

لە سینەمدا چ شیرین دڵ دەناڵێنێ بە مەحزونی

وەرن لەو شیوە گوێ بگرن، بە شین‌و شیوەنی نەیدا! «وەفایی»

تۆ لە مێژە دەتزانی دڵەکان دوو جۆرن: جۆرێك دەتوانی بیکڕی، یاخود بە کرێ بۆ ماوەیەك وەك کرێچییەك نیشتەجێی بیت!

بەڵام جۆرێکی دی هەن کە هەرگیز سەودا ناکرێن! مەگەر بەڕۆح!

وای لە گەورەیی دڵێك کە بێ تۆ ناژی! بۆ تۆ دەژی‌و بۆ تۆ دەمری!

بە پێڵوی چاوەکانی باوەشێنی خۆزگەکانت دەکات! هیواکانت

دەلاوێنێتەوە، فرمێسکەکانت دەکاتە ملوانکەی مرواریو بە گەردنی خۆی سەودای دەکات!

ڕۆمی دەڵێت: کاتێك دڵی مرۆڤ لە ئەوین خاڵی دەبێت، جگەلە بتێکی گۆشتو خوێنی وەك بەرد، هیچ سیمایەکی مرۆڤانەی پێوە نامێنێت!

دۆڵو دەشتی خاڵی لە ئەوین، لە کۆمەڵە خۆڵێك زێترنییە!

نیگەران مەبە، کاتێك تۆ ناتوانیت وەڵامی ئەو کەسانە بدەیتەوە کە ئازارت دەدەن. دێنە نێو گوڵستانی ئەوینی تۆو گوڵشەن دەخەنە ژێر پێو بێبەزەییانە گوڵەباخەکان دەوەرێنن!

خەم مەخۆ، ئەوە نیشانەی بێهێزی تۆ نییە! ئەوە دەری دەخات کە تۆ خاوەنی دڵێکی پاكو بێگەردو منداڵانەیت، کە جگە لە خۆشەویستیو ئەوین هیچی دی تێدانییەو بە فێڵو تەڵەکەی ئەم سەردەمە پیس نەبووە!

ڕێگە مەدە مەملەکەتە چکۆلەکەت بکەنە پەرێزی حوزنو ماتەم! پێبکەنە، مەهێڵە هەرگیز خەندە ماڵاوایی لە لێوەکانت بکات، چونکە هەموو هێزو دەسەڵاتی دونیا ناتوانێت، خەندەیەك بکوژێت!

تۆ دەتوانیت لە دژوارترین ساتەکانی ژیانا پێبکەنیت! لە نێو دەریای فرمێسکدا ڕێگا بۆ زەردەخەنەکان بکەیتەوە!

تۆ پەیامی خۆشەویستیو ئەوینت پێیە، لە وەرزی وەیشوومەو زریانو ڕەشەبای خەمیشدا، نەورەسە سپییەکان دڵیان نەهات جێت بێڵن!

کێ دڵی دێ تۆ جێ بێڵێ؟ کێ دڵی دێ تۆ بڕەنجێنێ؟ ئەی شازادەی مەملەکەتی ئەوین!

فەرموویان لێ بکە بۆ جیهانی پەپوولە، بۆ وڵاتی بەفرو تارای زیوین، بۆ دەڤەری خۆشەویستی، با بێنو ببینن کە ئەویندارەکان بێبەرامبەر دەسووتێن وەکو شەم، هەڵدەفرچێن وەکو پەروانە!

با بێنو ڕۆحی خۆیـــان بدۆزنەوە، با بزانن هەموو مرۆڤێك بەســـەردەمی منداڵیدا تێدەپەڕێت، وەلێ هەندێ کەس تا مردن، هەر بە منداڵیو هەرزەکاری دەمێننەوە!!

تەنها لـــە قوتابخانەی ئەویندا، مرۆڤ دەگاتە کەماڵ، لەوێدا مرۆڤ بە خودی خۆی ئاشـــنا دەبێو لە مانای مرۆڤانەی خۆی تێ دەگات، لەوێدا وانەی سووتانو گریانو توانەوەو ئاوێتەبوون بە ڕۆح دەخوێنێو دەگاتە ڕاحەتی ڕۆح!

ئەشكو ئاهی من هەتا بێ، زۆرترە ئاسوودەگیم

ڕاحـەتـی ڕۆحو دڵـە، ئـابو هـەوایـی سازگار «وەفایی»

لەوێدا مرۆڤەکان، ئیتر جیهانی لاشە جێدێڵنو بەرەو جیهانی ڕۆحو لیقای دڵ هەنگاو دەنێن، ئەوســا دەزانن کە گەیشـــتن بە لاشـــەی مرۆڤەکان، ئاسوودەگی نابەخشێ بە ڕۆح، سوکنایی نادا بە دڵ، چێژ نابەخشێ بە ژیان!

لـــە دونیایەکا دەژین، کـــە هەموو ئاواتی ئەویـنـــدار، ئیلتیفاتێکی مەحبووبەکەیەتی، بیســـتنی چریکەی ڕۆحو هەناســـەیەتی. نیگایەك، چرپەیەك، خەندەیەك، بە هەموو موڵکی دونیا سەودا ناگرێت لەوێدا!

کەی دەبێ وەك بولبولو گوڵ دابنیشین پێکەوە
ئەو بە خەندەی لێوی ئاڵو من بەگریەو شینەوە
باغی ڕوخساری لەمن پۆشی بەسەرپۆشی نیقاب
یانی لاچۆ عاجزم ئیمڕۆ بـەدەس گوڵچینەوە
تا قیامەت سەر لە سوژدەی شوکردا هەڵنابڕم
گەر بڵێی لاچۆ لەبەرچاوم، بە خەشمو ڤینەوە
تورکی چاوی گەر ببینێ عابیدی خەڵوەتنشین
دێتە جونبوش ئەوبە جوببەو خەرقەیی پەشمینەوە
با نەکا عاشق گلەیی ناهەق لە بەدبەختی ڕەقیب
خوێنی فەرهادەو گوناهی وا بەسەر شیرینەوە
سیحری غەمزەی وەردەگێڕێ زاهیدو عالم لە ڕێ
ئەم بە کۆڵێ عیلمەوە، زاهید بە بارێ دینەوە
گەر بڵێم قوربانی تۆبم، ڕوو لە من کە لەحزەیە
وەردەگێڕێ شەمعی ڕوخساری بەدەم ئامینەوە «ناری»

لەوێدا تەماشـای ئـەرواح دەکرێت، نەك ئەلـواح * تا دەگەیتە سـەرچاوەی ئیلهامو ئەسـراری دڵ، ئیتر ناتوانی ئەو دەڤەرە چۆڵ بکەی! لە ئەویندارت غافڵ بی، دژوارترین ساتو سەختترین کارەسات، ئەو کاتەیە کە لە ناکاو لە هاودەمی ڕۆحت دوورت دەخەنەوە! ئیتر جگە لە دەوڵەتی حوزنو ماتەم، لە هیچ خاکێکدا جێگات نابێتەوە!

تا لەمن ئەو ماهی چاو بەخومارە خۆی ون کردووە
تیفلی دڵمی تووشی بیماری سەروبن کردووە

من له حه‌لقه‌ی خه‌تمی نازا، زۆر هیلاكی غه‌مزه‌نیم
رابیته‌ی ئه‌برۆ، جگه‌رمی ئه‌نجن ئه‌نجن كردووه
تو خودا با هێنده بگریم، تا بزانن شاره‌زوور
سه‌یلی فرمێسكی من ئاوی زه‌ڵمی لیخن كردووه «بێخود»

ته‌نها له‌وێدا خۆشه‌ویستی بێبه‌رامبه‌ره، بۆ تامه‌زرۆیی لاشه نییه، ته‌نها له‌وێدا دڵ سوڵتانه، وزه‌ی ڕێگا ته‌نها فرمێسكو سوتانه، به ته‌نها ئه‌و ده‌ڤه‌ره مرۆڤستانه! ئازیزه‌كه‌م، هێزی ده‌وڵه‌تی عیشق بێسنوورو ئامانه، دڵنیابه ئه‌وه‌ی ساتێك بۆنی ئه‌وینی كردبێ، له ئازاردانی ئه‌ویندار په‌شیمانه، گشت ده‌زانن گفتو كرداری ئه‌ویندار، وه‌كو مانگی چوارده جوانه!!

ئه‌ویندار بۆ خۆی نازی، بۆ ئه‌م ژیانه باخه‌وانه، دیاریی ده‌ستی، ته‌نها چه‌پكه گوڵی جوانه، لێوی ده‌ریای دوڕو یاقوتو مه‌رجانی وشه‌ی جوانه! ڕه‌نگی خه‌نده‌ی وه‌كو شه‌وبۆو گوڵی مێخه‌كو شیلانه، بۆنو به‌رامه‌ی ئه‌وینیش تاڤگه‌ی میسكو عه‌نبه‌رو گوڵه‌باخه!

ئه‌وه‌ی بۆنی عیشقو ئه‌وین، كه‌یلو مه‌ستی نه‌كردبێ، هه‌موو ژیانی په‌شیمانیو ئاخو داخه!

سڵاو له گه‌وره‌ییو به‌رزیت ئه‌ی باخه‌وانی ئه‌م باخه!

---

* مه‌به‌ست لاشه‌یه به‌بێ ڕۆح وه‌كو ته‌خته وایه ألواح كۆی "لوح"ـه واته: ته‌خته‌دار

شنـەت هـەورێـکـی هێـنـاوە
چـاوی کـــردووم بـەسـەرچـاوە
یــادی بـسـکـی تــۆ دەکـــەمو
خەیاڵ، یەکسەر هەمووی خـاوە!

«ناسری حیسامی»



کڕێــوەی بەفــرو تاریکــی شــەوێکی درەنگی زســـتان، کپو بێدەنگییەکی ســـەیریان بە کەون دەبەخشــی، لە ســـەرمان لە دەوری ئاگرەکە گرمۆڵە بوو بووم، لە ناکاوڕا لە نێو خەرمانێك کتێبو پەڕەی پرشو بڵاودا قولاپی خەیاڵم لەم شیعرە گیربوو.

هەموو شەوێ
پەنجەرەکەم لەسەر پشتە
ئەڵێم بەڵکو
چرپەیەکی تۆی لێوە بێ!
شەماڵێ خۆیکا بە ژووراو
بۆنی عەتری تۆی پێوەبێ! «فەرەیدون بەرزنجی»

تەزوویەك لە ناخەوە هەژاندمی!

هەستم بە غوربەتی ڕۆحو تەنیاییەکی تاڵ کرد!

بە ئاسپایی هەڵســـامو بێ ویستی خۆم پەردەی پەنجەرەکەم لابـــرد، بەفـــر خەریکبـــوو تارایەکی ســـپی دەکردە بـــەر بوکی بوونەوەر، خەزان بێ وچان پرچی دارەکانی دەڕنی، دارتووەکەی ئەوبـــەری ماڵی ئێمە هێندەی گـــەڵا پێوە نەمابوو، چۆلەکەیەك بۆ شەوێك لە ژێریدا ئۆقرە بگرێ، گەڵاڕێزان ئیدی نەیدەهێشت باڵندەکان لە ژێر چەتری گەڵادا ژووان ببەستن! دەنگی بەفرەکە، وەکو چرپەی ڕۆح هێمن بوو!

پەردەکەم دادایەوەو گەڕامەوە نێو باوەشی گەرمی وشەکانت،

خـۆ ئەگـەر گەرمی وشـەکانی تۆ نەبا من بەم سـەرمایە ڕەق هەڵدەهاتم! هەڵمی هەناسـەت ڕۆحـم گەرم دەکاتەوە! عەبیری ئەوینی پاکت وەك پروشەی شەونمێکی شەرمن گوڵزاری تەمەن گوڵاو پرژێن دەکاتو سوکنایی دەبەخشێ بە دڵ!

خـۆ بە ئیختیـاری خۆت نییە! بـە دەسـتوری دڵ ناتوانی ئیمپراتۆری دڵت فەرامۆشکەی!

چونکە ناتوانی بێ ئەو چرکەیەك بژی!

دڵێـك بۆنی ئـەو سـروەی ئەوینـەی کردبێو بە شـازادەی مەملەکەتی ئەوین ئاشنابووبێت، ساتێك دووریی دەیکاتە قەفەس!

مەجنون دەڵێت:

چـاوانـم لـە یـەك دەنـێـم هـەرچـەنـدە خـەوم نایە
خـۆزگـە بـە خـەیـاڵیشبا ڕووخـسـاری تـۆم بدیایە

مەولانای ڕۆمیش دەڵێت:

أين صدر من فراق مزقا    کی ابث الوجد فيه حرقا

ڕۆمـی ڕاسـت دەکا دەردی دڵو شـەکوای دوریو فیراق لای کەسـێك دەکرێت، کە سـینەی بە خەنجـەری دووری پارە پارە کرابێو گڕی غوربەت هەناوی داخ کردبێ!

دەردی دڵ بۆ کێ بەیان کەم؟ دڵ کە ناڵاوێتەوە
ئەو گڕووی گرتوویە چیبکەم؟ بێ تۆ ژیر نابێتەوە    «هێدی»

ئـەو دڵە سـەبوری بە هیـچ نایەت، جگە لە دیـداری ڕۆح،

دووری لە نەسیمی ڕۆح گڕی ئاگرێکی بێ ئامانە! دڵ ناتوانێ ئۆقرە بگرێ، لە سەحرای وەحشەتدا بەرەو دیداری ئەبەدی هەنگاو دەنێ، چونکە دەزانێ بێ سروەی ئەوین، ژیانی مەحاڵە!

دڵم شەیدایە وێڵی دەشتو دەرما
بە بای عیشقت نە باڵم با، نە پەڕما
بە من ئێژی سەبوریت بێ سەبووری
سەبوری کردی ئەم هەرگە بەسەرما

«بابا تاهیری عوریان»

دووری لە ئەمینداری خەزێنەی دڵو سەرچاوەی ڕۆحو سۆمای دیدە، نەهاتییەکی بێ سنورو دەردێکی بێ دەرمانە:

ئەو نەهاتن دەردە، داغی ئەو نەهاتن: دەردەها
کەس بەدەردی من نەچێ، وەك من نەبێ تووشی نەهات «مەحوی»

لای جەمعی عاشقان دووریو چاوەڕوانیو تاسەی دیدار نەهاتیو دەردێکە کە دڵو هەناو لە نێو ئاگردانی شەوقو ئینتزاردا هەڵدەقرچێنێ!

ئەویندار ناتوانێ جگە لە وێنەی یارو ساتە وەختی دیدار لە نێو ساباتی ئەندێشەو خەیاڵیدا بیر لە هیچی دی بکاتەوە!

ئەو خەیاڵەش میوانێکی گەورەیەو جێگای سوکنایی دڵە!

لە گوێما دەنگی دەقڤولبابی دڵ دێ
خەیاڵی یارەکەم میوانە ئێمشەو «سالم»

خــۆ ئەگەر بە لوتفی خۆی وەعدی ویســاڵی پێ بدات، ئەوا وەکو ئێشــکچی تا بەرەبەیان دەســتەونەزەر ڕادەوەستێو پێڵوی چاو لێك نانێت:

هەر شەوێ وەعدی ویساڵت بێ هەتا ڕۆژ ناسرەوم
لەیلەتولقەدرە هەموو کەس حەز بە بێداری دەکا «کوردی»

دیــداری ئەوین، دیــداری وێنەو ڕوخســار نییــە، گوفتاری ئەوینــداران وتــەی زار نییــە، بەڵکو ئــەو کاتەی لــەدورێ ڕا ئەسرینی چاویان لە دەریای ئەویندا تێکەڵ دەبنو لێوی تاسەیان هەڵدەقرچێنن، ئەو کات زمانی دڵ بە گوێی دڵدا دەچرپێنێ!

ئیتر قرچەی دڵو سوتانی ناخو هەنیسکی دیدەو ئاهی سەردو گڕی دەروونە!

ئــەوە مونتەهــای ئاواتــی ڕۆحــە، ئــەوە گەیشــتنە بــە جەننەتولمەئوای دڵ، ئیتر دوور لە چاوی ڕەقیب لە ژێر ڕەشماڵی شەودا، ئەو کاتەی جگە لە ئەوینداران کەسی دی وەخەبەر نین، ئەوان لە ڤیستیڤاڵی نوردا وانەی شەمو پەروانە دەخوێنن!

کەسێ ڕێگای پێ بدرێ لەبەر دەرگای دیوەخانی ئەوین لەسەر ئەژنۆ وەکو غوڵام دانیشــێ، شاگەشــکە دەبێ لە خۆشیدا، تاجی شاهانی دەکرێتە سەرو دەوڵەتداری مەملەکەتی ئەوین دەکات!

ئازیزم: باڵندەکان بە پەروانەیان گوت: ئاخر داماو تۆ بۆچی ڕۆحی خۆت دەخەیتە خەتەرەوە؟

بۆچی باڵی خۆت هەڵدەفرچێنی، کە دەزانی لەگەڵ شــەمدا ناگەیتە ویصاڵ؟

تۆ لە پێناوی مەحاڵدا ڕۆحی خۆت بە هەلاکەت دەبەی!

بــەڵام پەروانە بەم وتەیە مەســت بوو لە خۆشــیدا گوتی: بەسە بۆ من کە هەمیشە شێتو شەیدای ئەویندارى خۆمو بە دەوریدا دەسوڕێمەوە، چی لەمە گەورەترە بۆ من!!

خــۆ دەڵێن پەروانەی دەوری ئەو شــەمەی! با پێش ســاتی ویساڵیش هەڵقرچێم!؟

**دڵ دەڵێی شێوەی وەفاداری لە زوڵفت فێربووە**

**وا بە دڵسۆزی ســەری هێناوەتە ژێــر پاتەوە** «هێدی»

ڕاوەستان لە ڕیزی غوڵامانی تۆدا موبتەغای ڕۆحە! قبوڵ کردنی تــۆ کە بتوانم نێوت بخەمە ســەر زارو وێنەت بخەمە نێو کونجی دڵم، تەشریفێکی وەهایە، نەمدەوێرا بە خەویش بیری لێ بکەمەوە!

هەرچەنــد دەکەم ناتوانم هیچ بڵێم: جگە لە شــەرمەندەیی چیدیــم پــێ ناکرێ، من هیچــم نەدەزانی لە ژیــان تا نەبومە قوتابی تۆ! هیچم نەدەبینی تا تۆ دەســتت نەگرتم! نەمدەزانی بۆ شایی نێو پەنجەکانم کێ پڕی دەکاتەوە! نەك بۆشایی دڵم!

ئێســتا تــۆ هاتیو هەمــوو کەلێنەکانی دڵو دەســتو ژیانو هەستو نەستی منت بە میسكو عەبیری بەهەشت پڕ کردەوە! دەســتت گرتم لە بیابانی حەسرەتەوە بۆ گوڵزاری هەمیشە

بەهار، لە دەیجورەوە بۆ دەڤەری نور!

لە باوەشی میهری تۆدا زمانم پژا، چاوم بە دنیای ئەرخەوانی هەڵهێنا!

تۆ هەر مرۆڤێکی ئاسایی نەبووی بەس!

تۆ هەموو مرۆڤایەتیت لە خودی خۆتدا بەرجەستە کردبوو!

لقــد فضلــت ليلــى علــى النــاس مثلما

علــى ألــف شــهر فضلــت ليلــة القــدر «مجنون ليلى»

محمد ئیقبال دەڵێت: پەروانە دەپاڕێتەوە... تەنها نیگایەکم پێ ببەخشە ئەی شەم، تەنها شەوێك سوتانم پێ ڕەوا ببینە، سبەی لە سەحەرا خۆڵەمێشەکەم فرێدە!

گەیشتن بە تۆ ئەی شەمی من بێ سوتانو هەڵقرچان مەحاڵە، ئەویندار هەیە نەزانێ ڕێگای عیشق چەندە خەتەرناکە؟!

دەزانـــم بـــادیـــەی عـیـشـقـە خـەتـەرنـاك

کەچی هەرچووم، ئەگەر مامو ئەگەر چووم! «مەحوی»

گڕی ئەوین نەبا عیشق بسمیل نەدەکرا لە هەموو ئەنجاسی شاوەتو ئارەزووی دوون پەرستی!

ئەویندار ڕۆح ناهاوێتە نێو ئاگردان بۆ گەشـــتن بە جەســـتە!

ئەو عەودالی ڕاستەقینەیە بۆ سەرچاوەی نوری دڵو خەیالی ڕۆح!

چ گەشتێکی پیرۆز بوو، هەنگاونان بۆ بەردەرگای شکۆمەندی

تۆ! بمبەخشە ناتوانم سەر هەڵبڕم تا ئێستا نەمتوانیوە تەماشات بکەم، من گەدایەکی بەر دەرگانەکەی تۆم، چۆن بتوانم بۆ نوری رووخسارت بنوارم؟!

ئێستاش من باوەڕناکەم بە مریدی خۆتت قبوڵ کردووم، ئاخر من هەموو ئاواتم ئەوەبوو تەنها ناوت ببیستم، نەك ببمە غوڵامت! هەیهۆ، من لە کوێو تۆ لە کوێ ئەی شازادەی مەملەکەتی ئەوین!!

کەی بە سەیحەی من ئەگا جەزبەی مریدی خانەقا

شەیخی ئەو پیرو موسیننە من جوانێ پیرمە «سالم»

من ئێستا سروەی ئەوینی تۆ زیندەگی دەبەخشێ بە ڕۆحم، عەبیری جوانیت گەردیلەکانی دڵم مەستەکات! گەرمایی بە دەزوولە خوێنینەکانم دەبەخشێ، من جگە لە تۆ ڕازێك بۆ بەردەوام بوون لە ژیاندا نازانم، لەو ڕۆژەوە بوخچەی هەموو خەونو خۆزگەکانم فڕێدایە مەملەکەتەکەی تۆ، گۆچانی سەفەری عومرم داناو، گەیشتمە ژووانی ڕۆح!

ئەگەر سروەی ئەوینی تۆ نەبا من هەناسەم نەدەدا!!

من ناتوانم بێمە کۆشكو تەلاری شکۆداری تۆ ئەی شازادەی مەملەکەتی ئەوین، بەڵام هەموو ئێوارەیەك لەگەڵ ڕۆحی مەحویدا بەم هەستەوە پێشوازی لە شەو دەکەم..

سەبا کوحلی غوباری ڕێی کەسێکی پێیە دێ "مەحوی"

بە بێ حیکمەت نییە دەفڕێ، لە ئێوارێوە گەر چاوم!



تاسەی دڵ
دڵ وڕکی دەری یاری لە من گرتووە هاوار
گەر بیبەم ئیتر نایەتەوە، نەیبەمە سووتێ! «کوردۆ»

له تاریکترین شــەوانی دەیجورا دێمــە دەرێو له دووت دەگەڕێم، دەگەڕێــم بۆ بۆنی نانو بۆنــی بوونو بۆنی نمەی باران، دەگەڕێم بۆ ڕووخساری نورینت، دونیای خۆم جێدێڵمو بەرەو دونیای تۆ ڕادەکەم!

هەموو شــەوێ خەو بە دزییــەوە دەمرفێنێ، چونکە دەزانێ من بێ تۆ ناتوانم بنووم!

تا ئەو کاتەی ئەو زەفەرم پێ دەبات، لەگەڵ ناسری حیسامیدا دەڵێم:

شــنــەی یـــادت لــە بـێـشـەمـدایـە ئـەمـشـەو
بـە نـەرمـی هـەڵـدەکـا ئـەو بـایـە ئـەمـشـەو
لــە دیـــدەم، ئـەشـکـی ڕوون ڕێـگـا دەپـرسـێ
سـەفـەر گـوایـە بـــەرەو دەریـــایـە ئـەمـشـەو
دەڵـێـی فـەرهـاد چـووەتـە خـەونـی شـیـریـن
لـە کـێـوی بـێـسـتـون دەنـــگ نـایـە ئـەمـشـەو
بـە شـادیـت، هـەر گـڕی مـۆم بـوو سـەمـای بوو
لـە ژووری بـێ چـــرا، سـەرمـایـە ئـەمـشـەو
کە تۆ بـووی، مانگ لە نێو گۆمدا مەلەی کرد
لـە پشت هـەورە، لـە ڕووی هەڵنایە ئەمشەو
وەرە، وە زمـانـی بـێـنـەو بـیـدوێـنـە
کـە پـەنـجەی تـۆی دەوێ ئـەو نـایـە، ئەمشەو
لـە نـاخـیـدا هــەزار گــۆرانــی مـەیـیـوە
لـە بـێ تـۆیـی، پـشـووی دەرنـایـە ئـەمـشـەو

بــه خـــاكو خـــۆڵ دەخــافــڵــێ تـفـڵـی بـێـواز
دڵـــم ســـەرپـــاك لـــە خــۆڵــتــدایــە ئــەمـشــەو
پـــــەڕو بـــاڵـــی وەریـــــــوەو عـــــار نـــانــێ
مــەلــی تــۆفــان، چ بــێ پـــەڕوایـــە ئــەمـشــەو

هەنگاونانی دڵ بۆ دەڤەری ڕۆح، ســـەفەرێکی شکۆدارە بەرەو گەنجینـــەی هەموو هیواو ئاواتو خەونەکانی دڵ، گەیشـــتنە بە ژووانی ئەو ئەوینەی کە سەرچاوەی هەموو خۆشیو لەزەتەکانی ڕۆحە، دووریو درێژی ڕێگا گرنگ نییە، وەرینی گوڵزاری تەمەن مەســـەلەیەك نییە! گرنگ نییە تا دەگەمـــە تۆ چەندم تەمەن دەمێنـــێ، ئـــەوەی گرنگ بێت ئەوەیە کە ئـــەو تەمەنەی ماومە لەگەڵ تۆی بەسەر بەرم!!

چونکە من لەو ڕۆژەوە پێت ئاشنا بووم لە نێوان دوڕیانێکدا خـــۆم یەك لایـــی کردۆتـــەوە، یا تـــۆ دەبێت هەمـــوو خۆزگەو ئاواتەکانی من بی! یان هیچێ!

ئیتـــر لەو ڕۆژەوەی ڕا، دڵ وەکو دێوانەیەك ســـالیکی ڕێگای ئەوینی تۆ بوو!

بێ نووری ڕووخساری تۆ کونجی دڵم تروسکەیەك بەدی ناکا!
هەموو سینەم بە عیشقی تۆ وەکو کوانوو بڵێسەی بوو
کـــە تینی پێ نەما ئیـــدی، هەموو هەر خۆڵی بەربایە.

«حیسامی»

ئـەو دڵـەی کە بۆتـە لانەی ئەوینـی ئەبەدی، بـۆ دیداری ڕووخسـارت هەمیشە کاری سـوتانو هەڵقرچانە، بێ یادی ئەو ژیان ماڵاوایی لێ دەکاتو ئاوەدانی تێیدا وجودی نامێنێت!

بە شوعلەی شەمعی ڕووخساری دەسوتێ دڵ وەکو قەقنەس
وتـم پـەروانـەیـە، یـا رەب، نـیـە وا بـانـگـو هـاواری

«تاهیر بەگ»

چونکە دووری تۆ تەنها دووری لاشـەیە، وەلێ تابلۆی سیمات لـە نێو دیدەمدا نەخشـێنراوەو بە دیواری دڵمدا هەڵواسـراوە، هەرچەنـدە بـە جەسـتە نەمتوانیوە غوڵامی دەوری شـەمعی ڕووخسارت بم، وەلێ ڕۆحم پەروانە ئاسا دەستەو دامێنی سوچی ژێر پێتە!

هەرچەندە بە جیسمانی کە دوورم لە حوزورت
روحیـانـەتـت سەبتە لـە نێو دیـدەی تەڕما

«حەریق»

شـەوانە سەیلی سروشكو ئەوجی مەوجی حەسرەت، دەگاتە حەرەمـی موحتەرمت، ئاو پرژێنی سـەرای حوسـنی تۆ دەکاو نامەی سکاڵات بۆ دێنێو دەکەوێتە پابۆست!

لـە بـاوەشـمـا دەدا مـەوج ئەشکی حـەسـرەت
کـەمـەرتـی گـرتـە بـاوەش تـا کـەمـەرچـیـن!

«مەحوی»

شــەوانە هەناسەی ســەردو هەنیسکی بە کوڵو قرچەی لێوو ســوتانی دڵ شــیوەنو ماتەمــی عومرێك لــەدووریو تەنیایی سازدەکەن! ئەو شەوانەی هێندە دەگریم، خەریکە گلێنەی چاوم بەســەر ڕوومەتی زەردمــا دێتە خواریو بینایــم لێڵەبێ، هیچ ڕۆڵەمردوویەك ئەو شــینەی من ناکات، هیچ جەرگ ســوتاوێك ئەو هاوارە گەروی ناتاسێنێ!

ئاخر من تا تۆم دۆزییەوە خەڵوزی پرچم بوونە بەفر، دەیان ســاڵە بۆ حەکیمێك دەگەڕام وانەی ئەوینم بۆ ئەدا کا، جگە لە تۆ مامۆســتایەکی دیــم بەدی نەکرد! لەو ڕۆژەوە ئەو کەســەم دۆزییەوە کە لە بێدەنگیم دەگات زێتر لە قســەکردنم، خۆشــی دەوێم بێبەرامبەر، ئاواتی قوربانیدانو بەخشینە نەك وەرگرتن، لە پێنــاوی مندا دەژی نەك بیەوێت لــە پێناویدا بژیم!! ئیتر من بێ ئەو حیکمەتێك بۆ وجودم نەما، ئیدی ئاوابوونی خۆری چاوەکانی تۆم وەکو ڕۆژی قیامەت دەهاتە پێش چاو!

ئەو کاتەی کە تۆش بوویتە هاودەمی ڕۆحی منو چاوەکانت وەکــو چاوانی من لــە خەمدا ئەســرینیان دەڕشــتو گوڵزاری ئەوینیان ئاودەدا، ئیتر من دنیام لێ ئاخر دەبوو!

چاوت کە چرای جوانییە هێند پڕ خەمە سوتێ
پێم وابێ کە ژین ئاخرە گشت عالەمە سووتێ «کوردۆ»

ئیتر ناتوانم واز لە چاوەڕوانی بێنم،

ئیتر ناتوانم نکوڵی لە مێژووی بوونم بکەم!

من ئامادەم هەموو عومرم بە چاوەڕوانی بەسەربەرم، بەڵام دڵنیـــام ڕۆژێك هەر دەبێـــت وادەی هاتنت ببەیتە ســـەر، ئیتر نەهاتیو نەهامەتی دووریت دەبڕێتەوەو چیدی ناڵێم:

لـە پـاش چەند وەعـدە قـەت جـارێ نەهاتی
ئـەمـیش بـۆ مـن نـەهـاتـی بـوو، نـەهـاتـی!
کـە تـۆ صـەیـادی، مـن صـەیـدی بـریـنـدار
حـەقـی مـن بـوو هـەڵـێـم، تـۆ بـۆ هـەڵاتـی؟ «کوردی»

تـــۆ دەلیلی منـــی، وەرەو دەســـتەکانم بگرە، بـــەرەو کەناری دڵنیایی، دە وەرەو بەزەییت بە حاڵی مندا بێتەوە، وەرەو شەوێ ســـەرێ بدە لە کوڵبـــەی ئەحزانی منو ببینە چۆن تاســـەی تۆ دەمکوژێت؟!

وەرە با تێر لە باوەشتدا بگریم، سنگم خەریکە شەق دەباو، گـــەردم خەریکە دەتاســـێ، دە وەرەو چیدی دڵم مەشـــکێنەو بە گەورەیی خۆت ســـەرێك لە کونجی تاریکی دەروێشـــەکەی خۆت بدەو بە ئیلتفاتێکی لەتیفی خۆت دڵی سوتاوی بەندە خۆشکەو شـــەوەزەنگ بگۆڕە بە ڕۆژی ڕوونـــاك، خەندە بگێڕەوە بۆ لێوی وشکم.......

دڵم مەشکێنە گەنجینەی خەیاڵی خۆشەویستیتە
بە عەشقی ئەو هەموو عەشقە لەگەڵ دڵدا مودارا کە

له تاریکی شەوا وەکو ئەستێرە خۆ دەرخە

بەزۆری ڕۆژی نوری ڕووت، سەراغەرقی سورەییاکە «کوردی»

مەولانــای ڕۆمــی دەڵێت: خۆشەویســتی، تاڵــی دەگۆڕێ وە شیرینی، خۆڵ بە زێڕو دەرد بە دەرمانو نەخۆشی بە نیعمەتو غەزەب بە ڕەحمەت!

ئەوین ئاســن نەرم دەکات، بەرد دەتاوێنێتەوە، ئەو ئەوینەی ئاوێتــەی خوێنــی ئەویندار بووە، تێکەڵ بە شــادەماری دڵبووە، خۆری هەرگیز ئاوا نابێتو گوڵزاری هەرگیز زەرد نابێت!

ئــەو کاتــەی ئەویندار خودی خۆی لە یــاد دەکاتو وجودی خــۆی فەرامۆش دەکاتو لە ڕوحی ئــەودا دەتوێتەوە، ئیدی بێ ئەو ژیان زۆر سەختەبێت، ئیتر ناتوانێت بێ یادی ئەو بژی، بێ وێنەی خەیاڵی ئەو پێڵوی چاوەکانی بکاتەوە...

زمانم شەق دەبا یەك دەم ئەگەر بێتو نەبا ناوت

بە کوێری دادەنیشم گەر لەبەرچاوم نەبێ چاوت «حەمدی»

ئیدی من جگە لە ئەوینی تۆ ئەنیســێکی دیم نییە، هەرگیز دەســت لەو ئەوینە بەرنادەم، داوای دڵی خۆم ناکەمەوە تا ئەو کاتەی ڕۆحم دەســپێرم، ئیدی کونجی میحنــەتو خەڵوەتگەی ئەوین چۆڵ ناکەم، گریانو هەڵقرچانو ســوتان، لەززەتی ڕۆحو سەعادەتی گیانە!

تــەواوی فەخــرو گەورەییە بــۆ من بتوانم ببمە ســوتووی

ئاگردانـــی ئەو ئەوینە موبارەکەو لە ڕیزی غولامانتدا دەســـتەو نەزەر چاوەڕوانی وادەی تەسلیمی ڕۆح بم!

وتـــم: عـیـشـق ئـاگـری گـرتـه وجـودم

وتـــی: هـــەر بـابـەتـی سـوتـانـه خـاشـاك «مەحوی»

بـــەڵام بەدەم ئەو ســـوتانەوە ڕۆحم دێتە ســـەما، بەدەم ئەو گریانەوە سۆمای چاوم فیردەوسێك بەدی دەکات کە چرکەیەکی بـــە هەمـــوو موڵکی دنیا نادەم، لەو ڕۆژەوە عەبیری هەناســـەت ناخی مەســـت کردوم ئیدی بارانی فرمێســـكو ئازاری ئینتیزار ئەداکردنی کەمترین ئادابی مەحەببەتە!

ئەی سروەی ڕۆحو سەرچاوەی بوونو سرودو دروودی وجودو بەســـتەی دڵم، ئەی چرای دیـــدەو مەرهەمی بریـــنو هەتوانی سینەی بریندارم، لە چاوەڕانیت ماندوو نابم..

پەیمان بوو کە بێیتو بە تەمابم شەوو ڕۆژێ

وا عومری تەمابوون، بە فەناچوون، چووە ساڵێ «کوردۆ»

تاسەی من بۆ تۆ، تاسەیە بۆ نیشتمانی ڕۆحو دەریای گوڵاوو گوڵـــزاری عومرو شەکرســـتانی هەموو خۆشـــیو لەزەتەکانی ڕۆح، ســـەرمایەی موڵکی ســـەرمەدیو گەنجینـــەی نەبڕاوەو سەفەری ئەوینە، فڕینە بەرەو وڵاتی هەورو دەفەری شەونمو ســـاباتی میهرو باوەشی حەوانەوەو دەریای پەپولەو هاودەمی ئەستێرەکان...

هێند نەخۆشی دەردی دووریـم وەختـە گیانو دڵ دەرێ
کـوا نـەسیمی سوبـحـدەم بـێ، عـەرزوحـاڵی مـن بـەرێ
دەردەدارم، بـێ زمـانـم، بـێ دڵـم، سـەودا سـەرم
ئـاخ لـە بـۆ دڵ مـیهرەبانێ، هـەم زمانـێ، هـەم سـەرێ!!

«وەفایی»

# کەی دێتەوە؟



لەو ساتەوە ئەم دەڤەرەت بەجێهێشت، ئیدی ڕەنگی خۆر بزڕکا، هەورەکان تارایەکی ڕەشیان وەکو بۆیمەکەی دایکمیان پۆشی!
نمــەی بارانەکەش بۆنی غوربەتو بێ تۆیی گرت! ئیدی ئەو بۆنە خۆشەی بارانیش نەما!

ئــەگــەر چــی ڕۆیــی، قــەت نــاچــی لــە یــادم
دەکـــــەم یـــــادت، بـــە یـــادی تـــۆوە شـــادم
کــە بــارگــەت بــۆ هـــەوار تێکنــا عــەزیــزم
شــکــا ئــەســتــوونــدەکــی تــاوڵــی مـــرادم

«هێمن»

بە ڕۆیشـــتنی تۆ ژوورەکەم پڕ بوو لە تەنیایی، جارێکی دی وەکو شـــەوانی منداڵیم دەستم کردەوە گریان، ئاخر تۆ خەونی هەموو تەمەنی من بووی، لە منداڵیمەوە چاوەڕوانت بووم..
تا تۆ نەهاتی من ترسم لە تاریکیو تەنیاییو دێوەزمە نەشکا!
چونکـــە من دەمزانی ئەو دێوەی منیان پێ دەترســـاند هەر مرۆڤەکان خۆیان بوون....!
تۆ ڕۆیشتیو جیهانە ئەفسوناوییەکەی من بوو بە نیشتمانی خەم!
ئەوســـا زانیم "نالی" لـــە دووری مەحبوبە چـــی عەزابێکی چەشتووە، ئەگەر نا، نەیدەگوت:

دەروونـــــم خــاڵــیــیــە، وەك نـــەی دەنــاڵــێ
هـــەوارێـــکـــی چ پـــڕ هـــــاوارە بـــێ تـــۆ!
بــیــنــایــم کــوێــرە هــەڵــنــایــە بــە ڕووی کــەس
مـــوژەم یـــەك یـــەك دەڵــێــی بــزمــارە بــێ تۆ
هـــەمـــوو ئـــەعـــزای نـــاڵــیــنــم دەنـــاڵـــێ
ســـەراپـــام مــثــیــلــی مــۆســیــقــارە بـــێ تۆ

«نالی»

دیدەی من دوور لە ڕووخساری تۆ بۆ کێ بنوارێ، دڵ بێ لە دەنگی تۆ بە دەنگی کێ ڕاچڵەکێو خۆی بە قوربانی کێ بکات؟ گوێ بۆ چرپەی کێ ڕاگرمو بە ڕووی کێدا پێ بکەنم؟ گیانم بۆ شاباشی بە پێیەکانی تۆ نەبێ، ئیدی بۆ چیمە؟!

تۆ نەبینن، نووری ئەم چاوانە بۆ چ!
بۆ نیساری تۆ نەبێ، ئەم جانە بۆ چ؟!

«مەحوی»

تا ئەو کاتەی سەفەرت نەکرد نەمزانی دەردی هیجرانی تۆ هێندە سەختە!

نەمزانی تۆ ڕۆحی مەملەکەتەی منی! بە ڕۆیشتنت گوڵەباخەکان دەمرنو گەڵای وەنەوشەکان زەرد هەڵدەگەڕێنو گوڵستان دەبێتە پوشەڵان!

ئەو شەوەی تۆ جێتهێشتم، وەکو شەوانی چاوەڕوانی تۆ سەرما دەرزی ئاژنی دڵی دەکردم، خەریکبوو لە ژوورەکەمدا ڕەق ببمەوە!

نەمدەزانی من بە بێ تۆ خاوەنی هیچ شتێك نیم!

تۆ کە هاتی تاجی شاهانەت کردە سەرم، کلیلی گەنجینەی بەختەوەریت دایە دەستم، منت کردە ئیمپڕاتۆری سەڵتەنەتی دڵێك کە ئەم سەرو ئەوسەری دیارنەبوو!

لەبەر تاقی بڕۆت بمرم چ نابێ
کە من شابم لە بن باڵی هومادا

«وەفایی»

ئەو ئێوارەیەی گەڕامەوە هەواری خاڵی، ماڵ ساردو ژوان چۆڵو دیوەخان تاریك، داروبەردی کونجە وێرانەکەم دەگریان...

ترس‌و سامێکی تاڵ دایگرتم، نەمدەتوانی بە تەنیا لە ژوورەکەم دانیشم، هەموو شتەکانم لەلا نامۆ بوون، تەنانەت وێنەی خۆشم لە ئاوێنەکەدا نەناسییەوە!

هەتا تۆم ئاشنا بووی! ئاشنام بوون
ئەمێستا موو بەموم ئەغیارە بێ تۆ

«نالی»

ئەو شەوەم لە دەیجور ڕەشترو لە یەڵدا درێژتر بوو، خەو لە چاوەکانم تۆران ...

لەو ساتەوە بە هاتنی تۆ فەرشی چاوەڕوانیم تەی کرد، لە یادم نەمابوو چاوەڕوانی تۆ چەندە سەختە!

شەوی چەندە درێژە کەسێ خەوی بتارێ
چەندە ئەستەمە مەمرۆ ژووان جێبێڵێ بە جارێ!!
بۆ سەفەرت کردو جێتهێشتم؟!

ئەی مەولانا نەیگوت: ئەم شەو شەوی ئەوە نییە ژووان جێبێڵن‌و لەلای یاری تاقانەوە بۆلای بێگانە بڕۆن، ئەم شەو شەوی ئەوەیە کە گیانە شیرینەکان بە ئاگری ئیشتیاقدا بۆ لای یەك بڕۆن!!

خۆزگە دەتبینی گڕی دووریت چۆن دەمسوتێنێ، بەچی زمانێك دەناڵێنم، بەچی نەوایەك دەگریم!!

وا لەبەر گریانی زۆرم هەردوو دیدەم گڵ ئەکا
بۆ دەوا چاوم لە چاوت سواڵی نەختێ کل دەکا

«میرزا مەنگوڕی»

لە نێو شوشەی عەترەکان‌و پەڕەی نامەکان‌و بەرگی کتێبەکانمدا بۆ سروەیەکی بۆنی تۆ عەودالم.. ئەمشەو تەنیایی دەمکوژێ!

خۆ لە مەرگ ناترسم.. ئەم دووریەی تۆ هیچ ئازارێکی بۆ مەرگ نەهێشتۆتەوە، تەنها لەوە دەترسم دیدار ئاخیرەتبین‌و نەتوانم

جارێکی دی لە حزورتا دەستەودامێن لەسەر ئەژنۆ دانیشم!

نیوە گیانێکم بمێنێ بەسمە تادێمە حزور

تا دوو سەد گیانت بە قوربان کەم بە نیوە گیانەوە «سەید»

ئەمشەو تەنیایی تەنیام، جگە لە خەم هاودەمێکم نییە، باوەشێك نییە پەنای بۆبەرم، لایلایەیەك نییە ژێرم بکاتەوە! ئەم شەو تۆ هەناسەکانت لێ ستاندمەوە، ئەمشەو چرای ژوورەکەمت بردوو نەتدامەوە، ئەمشەو گوڵی نێو باخچەکەت هەموو خستە نێو بوخچەکەتو جگە لە گەڵای زەرد هیچت بۆ جێنەهێشتم، بۆ وات کرد؟ خۆخەریکە بۆنی خەزان دەمتاسێنێو ڕەنگی خەزان دەمتۆقێنێ!!

لە ژێر چەتری ئەم شەوگارە،

خەم ئەنۆشم بە ئەسپایی «ئەحمەد محمد»

بێجگە لە تۆ کەس شك نابەم، بمداتەوە دڵنەوایی ، ئەم شەو جگە لە تەنیایی میوانێکی دیم نییە!

هەر کە دەزانێت تۆ دەڕۆی ئیتر دەبێتە دێوەزمەی سەر دڵم، ئازارم دەدات، ئەشکەنجەی ڕۆحم دەدات!

گیانەکەم... بۆ دەهێڵی، ئازارم بدەن؟ چۆن دڵتهات خۆت بڕۆییو منیش تەسلیمی تەنیاییو بێ کەسیو غەمو دووری بکەیت؟

واتزانی بەم کارەت، پەشیمانم دەکەیتەوە؟

ڕێم نییە ئاسوودە ساتێ دابنیشم بێ خەیاڵ

دەس ترازاندن لە عیشقت بۆتە فکرێکی مەحاڵ «راجی»

من خولیای ئەوینی تۆم، بێ سروەی ئەوینی تۆ دڵم ئۆقرە ناگرێ، عیشقی تۆ، ڕەگی لە نێو ڕۆحمدا داکوتیوە، بە نێو شادەماری دڵمدا ڕۆچووە! تۆ نمەی بارانێکی کە بەیاری عومرم، بێ ئەو پروشەیە وشکەڵانێکی زەردەو ڕۆحی شەکەتم بێ چرپەی لێوی تۆ سرەوتن نازانێت!

ئـەی کـە خـولـیـامـت بـە خـۆ ڕەنـگـانـدووە
عـەتـری عـەشـقـت تـاسـەمـی تـاسـانـدووە
مـن بـە ڕووی چـاوت ئـەپـەرمـم واکـەوا
سـوڕی ئـەم عـەشـقـەم لـە دڵ گـەوزانـدووە
تـاکـە بـاران ڕۆحـی خـاك بـشـواتـەوە
ڕۆحـی مـن هـەردەم بـەبـێ تـۆ مـانـدووە
مـەسـتـە شـیـعـرم چـونـکـە بـاسـی تـۆ دەکـا
شـیـعـری ئـاڵـم خـۆی لـە تـۆ ئـاڵانـدووە
قـەت مـەتـۆرە لـەم دڵـەی سـەوداسـەرەم
قـەت مـەگـۆڕە خـۆم بـە تـۆ ڕازانـدووە
ئـەشـكـو ئـاهـم سـەوزەکـا شـیـعـران لـە دووت
چـوون، کـە چـاوم ئـەو دڵـەی خـوسـانـدووە «نیان فاتمی»

کەی دێیتەوە، منو هەموو ئاواتو خۆزگەو حەزەکانم بە چەپکە نێرگزێکی ئـەم بەهارەوە چاوەڕوانیـن.. دەتوخوا ئیتر مەڕۆو ئەم هـەوارە جێمەهێڵە، باچیدی تەنیایی نەبێتە میوانم، با چیدی غوربەتی عیشق نەمکوژێ!

ئەم دەڤەرە بێ تۆ چۆڵە، ئەم بەهارە بێ تۆ زەردە....

ئەم وڵاتە بێ تۆ بێ نازە..

من ناخەوم، ئەمشـەو چاوەڕوانی هاتنەوەی تۆم، تا ئەو کاتەی تۆ دەگەیتە مەملەکەتی ئەوین لەگەڵ (فانی)دا، دەڵێم:

ئـەگـەر پـێـتـخـۆشـە کـوردسـتـان
وەکـو جـەنـنـەت مـوهـتـەداکـەی
بکە زوڵفی تەڕت شانەو سەعاتێ ڕوو بەرەو باکە
جلی کوردی لەبەرخۆکە لە بەزمی مۆدە پۆشانا
حـەیـاو حـوسـنو سـەفـا دەرخـە،
هـەمـوویـان بـێ سـەرو پـاکـە.

# هەرگیز نارۆم

بۆ وەفاتم، گەر وەفایێ کا، بەهاتن، یەڵک نەفەس
لازمە دەستەو دوعابم، تا ئەبەد مردن بۆ، وەفات
«ناری»

لەو ڕۆژەوە پێت گوتم: نەکەی بڕۆی! ئیدی من لەبەر دەرگای مەملەکەتی ئەوینی تۆدا ڕەشماڵم هەڵداو بوومە سالیکی تەریقەتی حەزرەتی پەروانە!

لەو ڕۆژەوە کە زانیم ژیانم هێندەی هەناسەیەك کورتە، ئیدی جگە لە پلانی ئەوین، نەخشەم بۆ هیچ کارێك دانەنا!

لەو کاتەوە، کە گوێم لە بانگی دڵم گرت، ئیدی گوێم بۆ دەنگێکی دی ڕانەگرت!

لەو ڕۆژەی ڕا، نەمتوانی بێ سروەی هەناسەت بژیم، بێ ئاوازی دەنگت بسرەوم! ئاواتم بە مردن دەخواست نەوەك ساتێك لێم دابڕێی!

توبیو سەری خۆت مەمخەرە زیندانی جودایی

خوێنم نییە، ها! بمکوژە بەم خەنجەری ئەبرۆ «وەفایی»

نەفەسێکی تۆ بە نەفایسی هەموو دونیا ناگۆڕمەوە، ساتێك لە دیداری ڕووخساری نورینت بە ڕۆحو دڵ سەودا دەکەم! گەردی پێت بۆ کلی دیدەم بە ئاوات دەخوازم، هەموو عومرم دەکەمە شاباشی ئیلتیفاتێکی لەتیفی تۆ!

لەسەر پەنجەی پێ، لە ئینتیزاری هەڵاتنی شەمسی ڕووخساری تۆدا دەستەو نەزەر، ڕادەوەستم!

نیگایەکی تۆ، ڕۆحی دەبەخشی بە ڕۆحم، حەیاتی دەبەخشی بە حەیاتم، نوری دەبەخشی بە سۆمای چاوم، نیدایەکی تۆ،

تاجی شاهانەی وەسەردەنام!

هەر کە ناوی من دەبا لێوت ئیتر ناوبانگی من

هەروەکو ئەستێرە بەرزە وا لەسەر شەمس و قەمەر

مرۆڤ دەتوانێت لە چەند چرکەیەکدا وشەی «خۆشمدەوێی» بدرکێنێ، بەڵام گەیشتن بەو مەحبوبەی کە شایانی ئەو خەڵاتە گەورەیەیەو دۆزینەوەی عومرێکی دەوێت!

سەعدی شیرازی دەڵێت: «یاران ڕێگەی عەشق ماڵێکی نییە، ئەم دەریا پڕ لە شەپۆلە کەنارێکی نییە!»

لەو ڕۆژەوە گەیشتمە حزوری ئیمپراتۆری دڵم، ئیتر قبوڵم کرد بە ڕۆحم پەروانەی دەوری ئەو شەمە بم، من بە پوش و پەڵاشی کوانووی عیشق ڕازی بووم، حەددم نەبوو خەونی پەروانەیی ببینم، ئێستا ببمە پەروانەی باڵا گەردانی شەمی عومرم، دەبێت ئیدی داوای چی بکەم لە شازادەی مەملەکەتی ئەوین!؟

هەر کەسێ تالبی تەلعەتی جانانەبێ

شەو ئەبێ خولق و ڕەوشت و سەنعەتی پەروانەبێ

با، دڵ و جەرگی بە خەنجەر پارە پارەو قیمە کەن

دەنگی ئاخ و ئۆفی نایە، چا، نیە، گەر ،وانەبێ

گەیشتن بە خاکی بەرپێی ئەویینداری ڕۆح، سەرچاوەی ڕازو نیازی دڵ، کانیاوی هەموو ئاوات و خۆزگەو هیواکان، خەونێکی بەهەشتیە!

چ جای ئەوەی مەحبوبەش وەکو تۆ عەودالی هاتنی تۆ بێتو دەیان ساڵ بێت وێڵی تۆ بێت!

دەبێت لە دنیادا لەو کەسە خۆشبەختتر هەبێت، کە بەو ئەویندارە گەیشتبێت کە پڕ بە دڵ خۆشیدەوێت؟!

لە ناخەوە شەیدای بێتو بۆی هەڵقرچێت!

دەبێت لەو ساتە خۆشتر هەبێت کە ساتوئانی مولتەقای ئەرواحە!؟

لەوێدا پارچەکانی ڕۆحت وێك دەگەن، لاشەت بە کەماڵی ڕۆح دەگات!

ئیدی خەوو خواردنو ئارەزووەکان چی بەهایەکیان دەمێنێت؟!

ئەو کاتەی نێوی خۆت لەسەر زاری ئەویندارەگەت دەبیستی، ئیدی ئاگات لەم دنیایە نامێنێ!

مەولانا دەڵێت: «ئەو دەنگەی ناوت دەچرێ، خۆشترە لە خەوی نیوە شەو»

دەبێت چی لە دیداری شازادەی مەملەکەتی ئەوین خۆشتر بێت؟

دەبێت چی لە ئاوازی دەنگی ئەویندارى دڵ بەسۆزتر بێت؟

مرۆڤ بێ گەیشتن بە پەڕاوی دڵو کەماڵی ڕۆحی دەبێت چی بێت؟

من بێ تۆ چیم ئەی نازەنینەکەم؟!

من له کویْو تۆ له کویْ ئهی یوسفهکهی کهنعانی دڵم؟!

ئهتۆ پهرژینی باغو دهشتی تاسهی

ئهتۆ بۆنی بزهو عهتری ههناسهی

ئهتۆ خهرمانی ههورو مۆمی یادی

گوڵی، بهندی دڵی، کهوبارِی تاسهی

تۆ ئهی ئهمینداری ڕۆحم، مانات بهخشی به ژیانم، بههات بهخشی به وجودم، بزهت بهخشی به لێوی وشکم، به پروشهی میهرو ئهوینت، پهرێزی عومرت بۆ کردمه گوڵزاری بهههشت، تۆ هاتیو لهحیرهتی ڕۆح نهجاتت دام، تۆ نهبای من دهمردم! تۆ نهبای من ئیدی کوێراییم دادههات!

ئهتۆ چاوی دڵو عهتری سلاّوی

ئهتۆ شاری بزهو هێزی ههناوی

ئهتۆ بارانی عهشقو بۆنی ژووانی

شهرابی، شهونمی، هێشووی ههتاوی «حهمدی»

ئیدی پێت سهیر نهبێت که پێت دهڵێم: من له دووری تۆ دهمرم! بێ ههناسهی تۆ دهخنکێم! بێ سهدای ئاوازی دهنگت کهڕ دهبم! بێ بۆنی گوڵاوی تۆ دهتاسێم! بێ شهرابی ئهوینی تۆ دهخنکێم!

من مردنم بینی له دووری تۆ، گیانی من، مردن زۆر خۆشتر بوو له دووری له تۆ!

من وەکو لالە، کە بێبەش بم لە قەدی وەك چنار

وەك یەکە بۆ من، چ داغی ئیشتیاقت بێ، چ، نار!     «وەفایی»

مولازەمەی ڕۆحم بۆ ژووانی دیدارت، چاوەڕوانی دیدەم بۆ گەردی تۆزی گەیشتنی کەژاوەکەت، توانەوەی دڵم بە گڕی دووریت، حاجەتی ڕۆحە، فەرمانی دڵە، لە دەستی مندا نییە!! جڵەوی عومری من وا بە دەستی پادشای حوسنی تۆوە ئەی حەبیبە!

دەستی تۆ باڵادەستەو ئەمری تۆ بێ بەربەستە، سوڵتانی ئەوینی تۆ حوکمی حەکەمەینی* وا بە دەستە!

دڵو ڕۆح گەیشتوون بە یەقینی موتڵەق، ئیدی ماچی ژێر پێی ساحێبی سەڵتەنەت بە ئاوات دەخوازن!

قەراری دا بەڕۆحو دڵ بەری پێی ماچ بکەم تا سەر

ئیلاهی عەهدو پەیمانی، حەبیبی من هەتا سەر بێ!

ئەوانەی شارەزای ئەوین نەبن، وا دەزانن ئەمە زیللەتە، مەخابن! نازانن عیشق چی عیززەتێك بە عاشق دەبەخشێو ئیختیاری مەعشوق شەرەفێکی هێندە گەورەیە، دەستی کێ دەکەوێت، ئەو کەسە نەبێت کە ئەستێرەی بەختی وەکو خۆر دەدرەوشێتەوە! ناهەقی نییە مەحوی کە دەڵێت:

چاوە، جێی ئەو شۆخە بێت، وتمو، وتی:

ئەم مەلا شێخە قسەی بێ جا دەکا!

یار، کەی بە ئاسانی بەو شوێنە ڕازی دەبێت؟چما مەحوی هەر خۆی نالێت:

گــەردی ڕێــی هــەســتــاوە، جــێ داوا دەکــا
بــەخــتــە! مــاڵــی چــاوی کــێ ئــاوا دەکــا!

یار ،کە بۆ تۆزی بەرپێی ماڵی چاو داوا دەکا، ئیدی چۆن ڕازی دەبێت بە جێگای چاو بۆ مەسکەنی خۆی؟!

بەڵام تۆ جیاوازی شازادەکەم، تۆ بەخشندەو خاوەن کەرەمی، تۆ میهری خاوەن میهری عەزیزم!

ئــەتــۆ مــیــهــریو مــەهــر  ڕوویــان ســتــارەن
لە خزمەت شەوقی تــۆدا شەو چرا چین!

دەزانم لە باخی دڵو گوڵزاری ڕۆحو پەرژینی موژەتدا، جێگام بۆ چادەکەی!

تۆ وێنەی کەس نیت! تۆ ئەی نازەنینم هەڵگری ئاڵای زومرەی عاشقانو پێشەنگی ئەویندارانی حەقیقیت!

بە لەیلاوە وەرە بەر قاپی ئەم لەیلایە ئەی مەجنون
شەهێکە سەد سەری فەرهادو شیرینی لەبەر پێ کەوت!

بێ خەم بە، من لە ئەداکردنی ئادابی مەحەببەت بێزار نابم، لە گریانی نیوە شەو،ماندوونابم، باکی سوتانو هەڵقرچانم نییە، عومرێك لە ئاگردانی عیشقی تۆدا نەسوتێ، دڵێك لە کورەی ئەوینی تۆدا نەتوێتەوە، من بۆ چیمن؟

گلێنەیەك بۆ تۆی پێ نەڕوانم تەماشای کێی پێ بکەم؟!

سەد هەزار دیدەم هەبێت، پێی ناڕوانمە هیچی دی

ئەو دەمەی ئەو بێرییە شۆخە، دێ بەرەو سەحرا دەچێت!

تۆ ئەی چریکەی هەناسەی گەردوون، ئەی ئاوازی ژیانی وجود، ئەی مەنبەعی سروری ئەبەدی، شەو چرای دیوەخانی دڵم، مانگەشەوی ئاسمانی ژینم، زێدو لانەو ژووانی ڕۆحی منی!

دڵنیابە هەرگیز ناڕۆمو ئەم دەڤەری نورستانە جێناهێڵم، بەبێ وجودی لازمی تۆ، من مانیعولوجودم.. چونکە هیچ ئیعتبارێك بۆ مەعدومێکی وەکو من دانانرێ، ئەی کاشفی ئەسراری وجودم!

بەشەرتێ دەوڵەتی لوتفت حەواڵەی حاڵی ناری بێ

بە دڵ بێ باكو موستەغنی، لە موڵکی چینو ماچینم

* حەکەمەین: ئەبو موسای ئەشعەری و عەمری کوڕی عاصن «ڕەزای خودایان لێ بێت» کە هەڵبژێردران لە ڕووداوی «تحکیم»دا.

ئەم شـەو پەنجەرەکەم بە ڕووی بارانەکەدا کردەوە، ڕێژنەی بارانـی بەهاربوو، گەڵاو گوڵەباخەکانی بە ئەسـرینی ئاسـمان دەشۆری، ئەو ڕۆژانەم بیرکەوتەوە کە بەیانیانی کۆتا ڕۆژەکانی بەهار، وەختێـك باران لە بەرەبەیانـدا دارهەنجیری ماڵەکانی ڕێـگای قوتابخانـەی پاك دەشـۆریو بۆنی گـەڵای هەنجیرەکە مەسـتی دەکردم، ئێسـتاش دوای زێتر لە بیسـت ساڵ من هەر کەیلو مەستی ئەو بۆنەم، بۆنی گەڵا هەنجیرەکان بۆنی توهرو پاکییـان لێ دەتکا، حەزم دەکرد لـە ژێر دار هەنجیرێکا ژووان ببەستمو نەچم بۆ قوتابخانە!

من حەزم دەکرد لەبەرباران پڕ سـینگم بۆنی گوڵاوو گەڵای شۆراو بکەم!

دەمویسـت خۆمو پەڕاوەکانیشم بسـمیل بکەم، ئاخر بۆچی باران هەموو شـتێك پاك دەکاتەوە جگە لـە ناخی مرۆڤەکان!؟ من نەمدەویسـت بچم بۆ قوتابخانە، دەمویسـت وانەکانم لەوێ بخوێنم! ئێسـتاش هەر بە هیـوام بەیانییـەك بگەڕێمەوە ژێر دارهەنجیرەکان، نازانم ئێسـتا ئـەوان ماون؟ یاخود من دەمێنم تا ئەو کاتەی جارێکی دی تێر بۆنی پروشـەی بارانو بۆنی گەڵا هەنجیرەکان بکەم!؟

بـەڵام ئەمجارە نامەوێت بـە تەنیا بڕۆم دەمەوێت تۆشـم لەگەڵ بی!

من دڵم بەم بارانەی ئەمشەو خۆشە، چونکە سالم دەڵێت:

**بە ئومێدی بەهاری وەسڵەکەی تۆ**

**لە هەوری دیدە هەر بارانە ئەمشەو!**

دەزانم ئەگەر تۆ بێیت، هەر ئەمشەو پێش بەرەبەیان، پڕ ژوورەکەم دەبێت لە بۆنی گەڵا هەنجیری تەڕو شۆراو، کوڵبەی ئەحزانم دەکەی بە گوڵستان، دەزانی چیدی من بەرگەی دووری تۆ ناگرم، دەزانی دوور لە نیگای تۆ، جگە لە دڵێکی شکاو، فرمێسکی ڕژاو، سیمایەك بەدی ناکەیت، ئەوسا کۆتایی بەدووری دێنی ئازیزم!

**بلوری دڵ شکا، وەك جامی مەی، فکرم ڕژا وەك مەی**

**نیشانەی دڵ شکاویمە، سروشکی ئاڵی خوێنینم!** «ناری»

من هەموو ژیانی خۆمم لە دەریای عەدەمدا لەیاد کردبوو، تا ئەو کاتەی کە تۆ هاتیو بە خۆشەویستی خۆت هەموو تاڵییەکانت کردم بە هەنگوین، دڕکەکانت کردن بە گوڵ، کوچەو کۆڵانەکانی ناخی منت وەکو زیخی ئەم بەرەوبەری جۆگەیەکی بەفرین شۆردەوە! تۆ بۆنی دار هەنجیرە تەڕەکەت لێ دەهات!

ئەو کات زانیم چاوەڕوانکردنی دڵێکی پاك، چاوەڕوانکردنی نەسیمی ڕۆحە،ساڵێکی هەناسەیەکە! چونکە هەناسەیەکی ئەو دوورییە ساڵێکە!!

هیوادارم پێش زەردبوونی گوڵەکان، پێش قەتیس بوونی

ئەسرینی بەهار، بێیتو کۆتایی بە تەنیایی بهێنی!

کوچـــەو کۆڵانەکان بیری ترپـــەی پێییەکانت دەکەن، منیش بیری ترپەی دڵت دەکەم!

بە تـــەواوی ئینتزار چاوەڕوانتم! کزەبـــای دوای باران بۆنی هەناسەی تۆم بۆ دێنیٚ!!

ئەمشـــەو کەسێك چاوەڕوانە، بۆ گەیشـــتنت ئامادەیە دەست لە داری دونیا هەڵگریٚ، مەولانا ئاســـا دەڵێت: هەرچی دەتەوێت بیبـــە، هەرچیـــم هەیە بیبە، هەرچی پێویســـتت پێیەتی بیبە، هەموو شـــتێکم ببـــە، کە دوورم دەخاتەوە لە تـــۆ! ئەگەر ناوی خۆشـــم دوورم دەخاتـــەوە لە تۆ، لە خۆمـــی دادەڕنم، من ناوم بۆچییە لە دووری تۆ!

سیمای ڕووخسارت لەیلیٚ لە نێو دیدەم نەخشاوە
زمانـــم بـــە نـــاوی تـــۆ لـــە ئەزەلـــۆ پـــژاوە
دڵـــم بـــە زیکـــرو یـــادت تـــەواو داگیرکـــراوە
ئیـــدی بۆ کیٚ بنوســـم، نامـــە بۆ کـــویٚ براوە! «مەجنون»

ئەو کاتەی دڵی مرۆڤێکی گەورە بە تەواوی ئەوینەوە دەروازەی خۆشەویســـتیت بۆ دەخاتە سەرپشت، ئیدی گەنجینەکانی دونیا هەموو بۆ سەودای هەناسەیەك لە ژیان ناشێن!!

ئـــەو کاتـــە دەزانـــی کە ئـــەو دڵە نیشـــتمانتە، ئـــەو مرۆڤە ناســـنامەتە، ڕەشماڵی ژیانو ســـێبەری عومرە! ئەو کاتە دەزانی

لەم جیهانی بێ کەسییەدا کەسێك هەموو کەسێکە بۆ تۆ، ئیدی لە بێکەســی نەجاتت دەبێت!! ئەو کەسە هەمیشە پێت دەڵێت: مەترسە من لەگەڵتم!!

ئەوســا تاڵیی ئینتیــزار دەبێتە حەلاوەتی ڕۆحو ســوکنایی دڵ! چونکە ئەوە چاوەڕوانی خودو گەڕانەوەی هەموو خۆشــیو لەزەتێکی ڕۆحە!

لە قوتابخانەکەی تۆدا بووم بە مرۆڤو ژوانم لەگەڵ فریشتەدا بەست، بەفرمماڵی کردوو بۆنم بە میسکی بەهەشتەوە کرد...

ئازارەکانی دووریو دڕکو داڵی حەسرەتو چاوەڕوانی شەهدی ئەوینن، چونکە ئەگەر ئەو ئازارانە نەبا، مرۆڤە پاکو بێگەردەکان لە هەوەســبازو ئارەزوو پەرستەکان جودا نەدەکرانەوە، ئەو دڵە سـپیو نورینانەی کە ســوتاوی تاوی ئەوینن، لەو دڵە ڕەشــانە جــودا نەدەکرانەوە کە لانــەی ئەهریمەنو قەترانی ڕقو کینەو درندەیین!

ئەویــن خۆی لە خۆیدا ســەرچاوەی گەورەترین ژانە، بەڵام ئەو ژانەیە کە هەمووان شــەیدای بووین، چونکە لە ناخی ئەو ئازارو ژانەدا ڕۆحمان لە دایك دەبێت!

چی لەو ڕۆژە خۆشــتر بوو دوای عەیامێك لە ونبوون خۆم لە دڵی تۆدا دۆزییەوە!؟

لــەم جیهانەدا دڵێك داڵــدەت بدات، هەمــوو ئێوارەیەك بە

ئەسرینی چاوی لە هەموو تەپو تۆزی ئەم ڕۆژگارەت بشواتەوەو بەرگی فریشتەت لەبەرکا!

نوقمی خۆشەویستیو متمانەو ئەوینت بکات، ئیدی چی باکم بە ئازارو ناڕەحەتییە!؟

خۆ من تا نەگەیشتمە حزوری دیوانی تۆ، مرۆڤبوونی خۆمم هەست پێ نەکرد!

گوێم لە دەنگی پێکەنین نەبوو بوو، سەدای ناڵەو هاواری ئەوین نەیان هەژاندبووم، پێناسەیەکم بۆ خۆشەویستی نەدەزانی!

بە گەیشتنم بە تۆ ماڵاواییم لە ژینی ئاژەڵیم کرد، جوانییەکانی ناخی خۆم بەدی کرد، بە خۆم ئاشنا بووم، تێر بۆنی خۆمم کرد!

لام وایە گەیشتن بە تۆ، ئیدی گەیشتنە بە ڕاحەتی ڕۆحو لەزەتی سەرمەدی، مردنو قوربانیدانیش ڕێگایە بەرەو بەهەشتی ڕۆح، لە ئەویندا ئیدی مردن نامێنێت، جاکێ بەو ئاواتە دەگات ببێتە قوربانت؟؟

گرۆهی عاشقان ئەمڕۆ هەموو هاتوونە پابوست
منیش هاتووم بفەرمووی بمکوژن، بمکەن بە قوربانت
لە کوشتن گەردنت ئازادە، بێتو بێیە سەر قەبرم
بە ڕۆژی جومعە بمنێژن، لەگەڵ جەمعی شەهیدانت

«کوردی»

هێدی هێدی خەریکە ئاسمان ڕوپۆشی ڕەشی ڕادەماڵێو دەسماڵی بەیان واڵا دەکا، بارانەکەش ماندوو بوو، تەنها پروشەیەکی وردی ماوە.

ئەوین فێری کردین بەرگی ڕیاو ڕووکەش پەرستی فڕێ دەین!

ئەو چاوە بەهەشتییەی ئەوین پێمان دەبەخشێت، قوڵاییەکانی حوسنی حەقیقی دەبینێت، ئێمە هەواو ئارەزووومان لە یەکەم هەنگاودا بە تیغی حەقیقەت سەربڕیو بە ئاوی چاوو گوڵاوی هەناسەی حەسرەت دەستنوێژی ئەوینمان هەڵگرت!

لە زەلکاوی قوڕو لیتەی حەیوانییەوە بۆ دەریاری نوور وەڕێکەوتین!

ئێمە بۆ خودی خۆمان ناژین، نەفسی خۆمان لە نوری ئەویندا توایەوە وەکو مۆم!

دەبێت جیهانێکی نوێ دروست بکەین، وردە وردە پێیەکانمان لە زەوی ببڕینو بەرەو ئاسمان هەڵکشێین!

ئەی نوری دڵو قووەتی ئەژنۆم، بەسە دووری ڕۆحم وەکو پەروانە، گەڕا دەورو بەری تۆ

«سید کامیلی ئیمامی»


نیشتمانی دڵ
نازانم تۆ گەورەی، یا دونیا بچووکە!
ئەی بۆ لە هەر گۆشەیەکی ئەم دنیایەدا
هەست بە بوونی تۆ دەکەم؟! (فروغ فروخزاد)

نەمدەویست کەسێکم خۆشبوێ، بەڵکو دەمویست شەیدای بم..
نەمدەویست خەڵاتی بکەمو سەروەتو سامانی بخەمە ژێردەست، بەڵکو دەمویست سەروماڵی بخەمە ژێر پێ!!
نەمدەویست ژیرانە خۆشم بوێ، دەمویست شێتانە شێتی بم!
نەمدەویست تەنها بۆنی گوڵاوی لێبێت، بەڵکو دەمویست سەرچاوەی عەترو عەبیرو گوڵاوی هەموو گوڵشەنەکانی دونیا بێت، جگە لەو ئیدی بە هیچ گوڵاوێك ئاشنا نەبم!
دەمویست لە نێو دڵیدا بژیم بۆ هەمیشە، لە هەناسەیدا بتوێمەوە! دەمویست ئەتڵەسی خەیاڵەکانم داگیربکات، گلێنەم ئەو نەبێ کەسی دی نەبینێت! دەمویست هەورو چەترو خۆرو کەپرو ڕەزو باخو خاکو ئاوو کەسو کارو گەلو هۆزو گۆچانەکەی دەستیشم با!!

دەبوو ئەو مرۆڤەبایە کە پێشتر هەرگیز نەمدیبوو، لە دوای ئەویش نەدەبوو هەرگیز بمدیبا!! دەمویست هیچم نەبێت جگە لە ئەو، ئەویش هەموو موڵکو سەروەتو سامانو مەملەکەتی من بێ!

ئەگەر سایەی سەری تۆ بێ بە تاجم
چ موحتاجم بە تاجو ئەفسەری کەی

«ناری»

من هەموو زەویم پێ تەنگ بوو، جێگام نەدەبووەوە، دەرگا نەما لێی نەدەم، بەڵام هیچیان ماڵی من نەبوون، تا ئەو کاتەی

له دەرگای ئەو دڵەم دا کە هی من بوو! تەنها من..........

پێشـــتر هەموو جیهان لە ئاواتەکانی مندا، ون دەبوون، بەڵام ئێســـتا هەموو ئـــاواتو خۆزگەکانم لە گەورەیـــی ئەو دڵەدا ون دەبێت! سروەی ئەو مەملەکەتە دەڵێی نەسیمی بەهەشتە!

وای لەو ساتەی دڵێك دەبێتە نیشتمانت!!!

تۆ دەبیتـــە پارچەیەك لە ئەو، ئیـــدی هەنگاوەکانت لەگەڵ ترپـــەی ئەو دڵەدا ڕێك دەخەیت، ناتوانی بێ ئەو بیربکەیتەوە، چـــوون ئەو دەزانێـــت تۆ بیر لە چـــی دەکەیتـــەوە، حەزت لە چییە!؟داوای چی دەکەیت، دەتەوێت چی بڵێیت!

ئـــەگـــەر دڵ دڵـــبـــەرە، دڵـــبـــەر نـــەزانـــم!
ئـــەگـــەر دڵـــبـــەر دڵـــە، دڵ دەن نـــیشـــانـــم
دڵو دڵـــبـــەر ئـــەوەنـــدە تـــێـــکـــەڵاون
جـــودانـــیـــن بـــۆم دڵو بـــەنـــدی گـــیـــانـــم

«بابا تاهیری عوریان»

لـــەو توانەوەیەدا، لە فەنابوونی ڕۆحـــدا، لە ونبوون لە نێو گوڵســـتانی عومرا، ئەو کاتەی پـــێ دەخەیتە ئەو دیو دەروازەی دڵ، ئیـــدی چاوت بـــە مەملەکەتی ئەوین ئاشـــنا دەبێو هەموو ڕووپۆشـــەکان لەســـەر چاوت لادەبرێن، ئەوســـا بە چاوی خۆت هەموو حەقیقەتـــەکان دەبینی! دەگەیتە کانیاوی هەموو هیواو ئاواتەکانت.

ئەوسا دەزانیت تۆ پێشتر هیچ نەبوویت، هەموو هەناسەکانت جگە لە حەسرەت چیدی نەبوون، ئاخر هەناسەیەك بێ میسكو گوڵاوی هەناسەی ئەویندار، چی ڕاحەتێ دەبەخشێ بە ڕۆح؟

ئاخـــر دیدەیـــەك بێ دیـــداری خەزنـــەداری گەنجینـــەی دڵ، چی دەبینێت؟

بێ چرپەی ڕۆح بە چی ئاوازێك ڕۆحت مەستە بێ!؟

پەروانەی حەزو تاسەت ئاوێزانی چی شەمێك دەبێت؟

دەبێتـــە بـــاڵا گەردانی کـــێ!؟ کێ بێتو گەوهـــەری وجودت بدۆزیتەوەو........ ناسنامەی بوونت پێ ببەخشێ!

کەی دەگەیتە دامێنی ئیمپراتۆری دڵت!؟

بـە دڵ خـۆزگـەم بـەوانـەی وان لـە سـەودات

کـە هـەردەم دادەنـێـن، سـەریـان لـەسـەر پـات

هـــەزار خـــۆزگـــەم بـــە ئـــاواتـــی کـەسـانـێ

کـــە دەخـــــوازن لـــە دڵـــدا تـــۆ بـــە ئـــاوات

«بابا تاهیری عوریان»

ئۆخەی سەمەری عومرو فەرمانی هەزاران شەوی چاوەڕوانیو سەداو زایەڵەی هاوارو ناڵینی نیوەشەو، لە کۆتاییدا تەشریفت هێنـــاو دەســـتت گرتم بـــەرەو ژووانی ڕۆح! بەخێر هاتی ســـەر دیدەکانم!

بـــە هاتنت ئیدی باڵی فریشـــتەت پێ بەخشـــیم، کەشـــکۆڵی

خەمەکانت لێوەرگرتم خەیاڵەکانت کردم بە حەقیقەت، شەوەزەنگت کردم بە چراخان، ئای چەند کەس بە حەسرەتی ئەم ڕۆژەوە مردنو نەگەیشتنە تۆ!

قەسەمت ئەدەم وەزات ئیلاهی

وەسڵی دۆست خۆشە، یا گەنجی شاهی؟

«عەباسی کەمەندی»

بێگومان بۆ کەسێك گەیشتبێتە مەئمەنی ڕۆحی، ئیدی شا بە سەپان ناگەڕێو ئاوڕ بۆ لای گەنجینەی شاهانە ناداتەوە!!

دوای دەیان ساڵ سوتانو هەڵقرچانو وێڵو عەوداڵبوونو تاسەو حەسرەت، ئەوسا دەزانی گەیشتن بەو کەسەی کە پەڕاوی ڕۆحت دەخوێنێتەوە، چی خەڵاتێکی گەورەیە! ئەو کەسەی دەزانێت تۆ عەوداڵی چیت! ؟ پێویستت بە چییە!

چونکە ئەو شارەزای کونجو کەلەبەرەکانی ڕۆحو گیانی تۆیە!

ئیدی پەردەکان لەسەر بینایت لادەبرێن! دەچیتە نێو مەملەکەتی ئەوین، لەوێدا لە دەریای ئەویندا پاك دەبیتەوە، دەبیتەوە مرۆڤ!

گوێت لە دەنگێك دەبێت لە ئاوریشم نەرمتر، مەستی گوڵاوێك دەبی لە میسكو عەنبەر زۆر سەیرتر، ئیدی نیگای نورینت بۆ لای باقو بریقی ڕێگا ناڕوانێت! ئیدی جگە لە باوەشێك، خەون بە ژوانێکی دییەوە نابینی!

ئیدی ناتەوێت جێیبهێڵی، ناتەوێت چرکەیەك لێی دورکەویتەوە!

ناتەوێ پێڵوی چاوەکانت لێك بنێیو بنووی! چۆن دەتوانی ئەو شەمسی ئەنوارە فەرامۆشکەی؟!

وەنەوزێکم شەوێ دا، گەییە سەرمو
وتی: هەستە، هەتاوت وا لەسەرکەوت

«مەحوی»

شەوانە بێ خەیاڵی ئەو ئۆقرە ناگری! بێ دەنگی ئەو خەونابێتە میوانت! بێ بۆنی هەناسەی ئەو ڕۆحت پشوو نادات! ئەو کات دەزانی مەحوی بۆ دەڵێت:

لە دنیا جەننەتی خۆ دیوە هەر کەس
کە تۆ بێ حازری، وەختی وەفاتی!

ژیان لەگەڵ هاودەمی ڕۆحت شنەیەکە لە بەهەشتەوە هەڵدەکات، کاتێك فێری ئەو جۆرە ژیانە دەبیت، ئیدی ناتوانی دەستبەرداری بیت!

وەکو منداڵ بۆی دەگریت، ئیدی ناتوانی ڕازی ئەوینت داپۆشی، ناتوانی فرمێسکەکانت بشاریتەوە، ئاخر تۆ پێشتر زیندوو نەبووی! ڕۆحت تێدا نەبوو! نەتدەزانی تۆ چی مەخلوقێکی! بۆچی دەژیت؟

تازە فەرمووتە لە لای کەس ڕازی عیشقی من مەڵێ
نەت دەزانی دڵ کە کون بوو، دەنگی لێدێ وەك جەرەس

«حەریق»

ئەوین دەروونەکان پاك دەکاتەوە، سینەی مرۆڤەکان بە ئاوی زیو دەشۆرێت، جگە لە سۆزو خۆشەویستی هیچی دی لە نێو دڵی ئەویندارا جێگای نابێتەوە، بەڵکو دڵ دەبێتە دەریایەك شەپۆلی خۆشەویستیو هەستو نەستو سۆزی مرۆڤانە، خۆی بە نێو مرۆڤەکاندا پەخش دەکاتو جیهان دەکاتە گوڵستان!

ئەوەی ئەوینی ناسیبێ، ئیدی دەبێتە موریدو سائیلی ئەو عەتا بێ وێنەیە! بێ زەکاتی ئەو حوسنە بێ نەزیرە ڕۆح لە زیندەگی حەقیقی مەحروم دەبێت!

من بە شەرعەن موستەحەقم بۆ زەکاتی حوسنی تۆ
تۆ کە صاحێب دەوڵەتی، بێ بەش لە ئیحسانم مەکە

«ناری»

تەنها لەوێدا مرۆڤ لە خودپەسەندیو خودپەرستی قوتاری دەبێت، ئیدی خۆی نابینێت نەفس پەرستی یەخەی بەردەدات، لەسەرو ماڵی خۆی دەبوریو شاباشی ئەو کەسەی دەکات، نوقمی مەحەببەتی پاکی ئیلاهی دەکات.

وانەی ئەوینی ئیلاهی لا دەخوێنێو بە نەشئەی «سلام علیکم طبتم فادخلوها خالدين» مەستی دەکات ئیدی بۆ خلودی

ئەبەدی هەنگاو دەنێت، پوش‌و پەڵاشی ئەم دنیایە فریوی نادات، باق‌و بریقی فانی غافلگیری ناکەن!

هۆ ئیمپراتۆری دڵم، شـــازادەی مەملەکەتی ئەوین، گەیشتنم بە تۆ، گەیشـــتنم بوو بە جەماڵـــی حەقیقی‌و دەریای حەقایقی ســـەرمەدی‌و ڕازو نیـــازی ڕۆح، ئەگـــەر تـــۆ دەرگای دڵت بۆ واڵا نەکردبام، ئێستا دێوانەی کام بیابانی دۆزەخ دەبووم!

مـــن چۆن بتوانم سوپاســـت بکەم کە ئێســـتا بەهەشـــتی دڵی تۆ نیشتمانە!

ئای لەو ســـاتەی مرۆڤ دەگات بەو کەســـەی لە خۆت زیاتر خۆشی دەوێی!!

ئـــەو کاتەی خۆت لـــە بەرزترین نموونـــەدا دەدۆزیتەوە، بە هەموو ئەو خۆزگەو ئاواتانەوە، کە ئاواتی عومرت بوون!

ئیدی لـــەو ئەوینـــەدا چـــۆن ناتوێیتـــەوەو لـــەو دەریایەدا فەنانابی!؟

هەر کە دەتبینم دەڵێی تۆ شەم‌و من پەروانەتم
تا ســـەرپا نەبمە کۆی زوخاڵ قەت ئارام ناگرم

«وەفایی»

زۆر ئازارم چەشـتووە، برینی قووڵ، جەستەی کێڵاوم.. وەلێ ئازارێکم نەدیوە، چەشـنی دەردی دووری، تاڵو ئەسـتەم بێت! سوتان بە دەوری ئاگری دووریو هەڵقرچان لە نێو گڕی تاسەو چاوەڕوانیو تامەزرۆیی بۆ دیداری ڕۆح، ساتێکی ساڵێکەو گریان بۆ نیگایەك، هەموو هەنسکێکی سەکەراتی مەرگە!!

ئەم دەردە بێدەرمانە!

دڵـی بریندار وە کەس ژێر نابێتـەوە، ئەو برینە وە کەس سارێژ نابێت!

دڵ لەبـەر زامـی فیراقـت دائیمـا زاری دەکا

ڕۆژو شەو مەنعی دەکەم بەس زامی سەختە ناسرەوێ

«کوردی»

دەیان ساڵە بە سەرو ماڵم، عەوداڵی ئەوینی تۆم، دڵنیابووم کە بازرگانی ئەوین، هەرگیز مایەپووچ نابێت، ئەگەر سەروماڵیشی لە ڕێدا دابنێ!

من لەسـەر هەموو زەویدا، جگەلە دڵی تۆ، نیشتمانێکم نییە بۆ ئاسودەیی دڵم، ئێستا کە سەرچاوەی خۆشبەختیم لای تۆیە، بێ ئەو دەریای سەعادەتە چۆن بژیم!؟

مەحوی ئەمرۆ زۆر نەخۆشە، قەت شیفای نایێ بە هیچ

گەر شیفای بێتن، بە بۆیی زوڵفو ئەو ئەگریجە دێ

جگە لە ئەهلی دڵ، نازانن کە دووری لە ئازیزێك کە موڵکداری هەموو ڕازو نیازێکی دڵە، یانی چی؟

نازانن کاتێك ئەو دەڕوات تەواوی وجود لەگەڵ خۆیدا دەبات، گوڵستان بێ بۆو باخی عومر بێ سەمەرە! تێپەڕبوونی هەموو ساتێکی تەمەن وێڕای بەفیڕۆچوونی، جگە لە زووخاوی مەرگو وەرینی پەڕەی زەردی تەمەنو ژاکانی هەموو حوسنو جوانییەك چیدی نییە!

نەمامی عومری من، بێ بەرگە بێ تۆ
خۆراکم، زوخو خوێنی جەرگە بێ تۆ
مەفەرموو بمرە، ژینی چی عەزیزم؟
ژیانم، ساتێ سەدجار، مەرگە بێ تۆ

«کەمەندی»

لە زەمەنێکدا مرۆڤەکان لە یەکدی هەڵدێنو ئارەزووی دیداری یەك ناکەن، ئەی چۆنە وەها ئێمە، بێ یەکدی ئۆقرە ناگرینو ساتێك ناسرەوین بێ یادی یەك، چۆنە بەو یادەوە درێژە بە ژیان دەدەینو هێشتا هەناسە هەڵدەکێشین؟

من دەتوانم بێ هەموو مرۆڤەکان بژیم، وجودی ئەوان لە وجودی مندا، هیچ شوێنێکی داگیر نەکردووە، وەلێ تۆ جێگات بۆ وجودی خۆشم نەهێشتووە، گەر تۆ نەبی، من نازانم دەبێت لە کوێ بم؟! ئەورۆ، پەیوەندیی مرۆڤەکان لە سنورێکدا

ڕادەوەستێت، جگە لە پەیوەندیگەلێکی ماددی شتێکی دی بە یەکیانەوە گرێ نادات!

دواتر کە لە پەیوەندییەکی خەیاڵی لە نێوان ڕۆحدا ئاگادار دەبن، ناتوانن باوەڕبەخۆیان بهێنن لە ژووانی ئەوین حاڵی ناوون، هەڵبەت ئەوان ئاوێتە بوونی ڕۆح نازانن، توانەوە لە ناخی یەکترو ڕۆچوون بە دەروونی یەکتردا نازانن واتای چییە!

ئەوان نازانن کاتێك کەسێك، لە ناخی دڵییەوە هێندەی مانای خۆشەویستی خۆشیدەوێیو لە تۆوە تەماشای هەموو خۆشییەکانی دونیا دەکاتو دوور لە تۆ ناتوانێ ئیدراکی زاتی خۆشی بکات، ئەمە چی گەورەییەکە!!

ئەوسا ئەگەر لەوەها کارێك تێ بگەن، ئیدی پێیان سەیر نابێت، کە ئاواتی ئەوە نییە لە ڕێگای ئەوەوە بگاتە مەتاعێکی کەم، بەڵکو هەموو دونیا دەبەخشێ بۆ گەیشتن بە دامێنی لوتفی ئەو! چونکە لای ئەو، سەودای خۆڵی ژێر پێی ئەو مرۆڤە بە هەموو دونیا ناکرێ!!

ئەو کاتەی لە ژووانی ڕۆحدا، بە زمانی بەهەشتی دێنە گوفتار، ئیدی دونیای دەنی، هیچ باسو خوازێکی نامێنێو فریشتە ئاسا جیهانی مادە فەراموش دەکەنو جگە لە لەزەتی ڕۆحو لیقای دڵو سکاڵای دڵ، هیچ سروودو دروودێکی دی نابیسرێ!

چرپەی ڕۆحو سروەی ئەوینو پەیامی دڵ، جیهانێك

دروستدەکەن، مرۆڤ تا نەچێتە ئەو مەملەکەتی ڕۆحە، هەست بە بەهای مرۆیی خۆی ناکات!

ئەوسا ڕۆح ئازاد دەبێ، زمان دەکرێتەوە، دڵ پەڕاوی خۆی والا دەکات، لەوێدا دەتوانی قسەی دڵت بکەی، خۆزگەکانت بڕوێنی، خەونەکانت بهێنیتەدی!

ئیدی ناتوانی لەو مەملەکەتە کۆچ بکەی، ئەگەر سەریشت دانابێ، چوون لە دووری ئەو دەڤەرە، تۆ ئیدی خاوەنی هیچ نیت!

وا سەرم دانا بە عەزمی بەردە بازی ڕێگەکەت
مەرهەمی دەردی سەری من، وا بە گەردی پاتەوە
گەر دەپرسی حاڵی پەروانەی دڵم، دووربێ لە ڕووت
وا لە سۆزشدا لە سایەی شەوچرای گۆناتەوە

«ناری»

کێ تا ئێستا بازاڕی ڕۆحی بینیوە؟ کێ تا ئێستا چۆتە لای پیری دڵ؟ کێ گوێی لە نەغمەی نەوای بولبولی ئەوین بووە؟ کێ گەیشتوە بەو کەسەی کە بوخچەی هەموو ڕازو نیازەکانی فڕێدابێتە ژێر پێی؟ کەواتە هەموو دونیا دەبنە دووژمنت ئەو کاتەی باسی هاودەمی ڕۆحت بۆ هاودەمانی دونیا دەکەی!!

لەسەر تۆم دوشمنە دنیا، قەضیەم «مانع الجمع»ە
کە تەرکی تۆ نەکەم، تەرکی هەموو دنیا نەکەم چیبکەم

«مەحوی»

ئــەو کات کە لە پێناوی ئەودا، تەرکی هەموو دونیا دەکەیو لە دونیا ویستان پەراوێز دەگریو لە کونجی دارولحوزنی خۆتدا، دەســتلەملانی خەم دەبیــتو بۆ دووری میری دڵت، ئەســرین هەڵدەوەرێنی، بێ سەرچاوەی شادیو سەعادەت، چیت لە دەست دێت جگە لە گریان...

لە دارولحوزنــی دووری، ئیختیاری غەم نەکەم چیبکەم؟
بە بێ مەعشوقی شادی، دەس لە مل ماتەم نەکەم چیبکەم؟
نەبوو بۆ من دەمێ غونچەی ســرودی گوڵشــەنی وەصڵت
لە خارستانی هیجرەت، خاری میحنەت، جەم نەکەم چیبکەم؟

«ناری»

دەزانم گڕی دووری، ئاگر لە ناخت بەردەداو ســینەت دەکاتە قەفەنــەس، ئــەو کاتەی خــۆت لــە بیابانــی دووریو تەنیاییدا دەبینیتەوەو کەســێك نابینی لەگەڵی بدوێی، ســیمایەك نابینی تەماشــای ڕووخساری نورینی بکەی، ئاوازێك نابیسی، گوێی دڵی بۆ ڕادێری! سروەیەك لە بەهەشتەوە فێنکی نابەخشێ بەڕۆحت! ئیدی حەز دەکەی لەم دنیایە بڕۆییو ئەم دۆزەخە جێبێڵی:

بــۆ ئــۆغــرکــردنــی مــن بــووم بــە قــەقــنــەس
کە ئـەو چـوو بۆ سەفەر من بۆ سەقەر چووم

«مەحوی»

گوڵەنـــدام، دەردی دووریی تۆ، گـــڕەی چلەی هاوینی عومرە، چرۆی حـــەزو ئاواتەکانم ئـــاوری تێبەردەداو من هەمیشـــە لە دووریـــت خەمیـــدەو پەراگەندەو بێمـــاوام، شـــەوانە ئەگەر بە فرمێســـك، شـــەودێری دڵم نەکەم، وەکو دارێکی وشکەڵاتوو، لە ڕەگەوە دەسوتێم!

وەلـــێ دڵنیـــام ڕۆژێك هەردێـــتو ئیـــدی دووری دەبڕێتەوە، گوڵخەنـــی تەنیاییو نامۆیـــی، دەبێتە گوڵشـــەنی دیداری ڕۆحو ئۆخژنی دڵ، ئەم ئازارەی ئێستاش، مەراسیمی تەریقەتی عیشقە، ئەی نالی بۆچی دەڵێ:

عـەشـق سـوڵـتـانـێـکـە هـەرکـا ڕوو لـە وێـرانـی بکا
ئـاهـی ســـەردو، ئەشکی گـــەرمو قەلبی بـوریـانـی دەوێ

میهرەبان بە ئازیزم میهرەبان، ئەویندار دەبێ میهرەبان بێت!

تـــۆ دەتەوێت بەرەو دڵێك هەنـــگاو بنێی، هێدی هێدی بڕۆ، تـــۆ دەتەوێـــت ناخی مرۆڤێك بكەی بە ژوانی هەمیشـــەییت بە ئەسپایی بدوێ، ئازیزم بە ئەسپایی!

ئیدی تۆ دەبێت لە بوونی خۆت دەست هەڵگری!

سەرەتا كەللەی سەرت فڕێ دە ژێر پێی یار، ئەوسا خۆت بە سالیكی ڕێگای ئەوین بزانە!

تا نەبووری تۆ لەسەر، ڕێی ناخەیە مەیدانی عیشق

ســـەر لە پێش پێ دەبێ، لەم ڕێگە دانێی «أولا» «مەحوی»

تا لە ڕۆحی خۆت نەبوری، ڕێگای ئەوین نادۆزیتەوە! هەرگیز!

لـــە ونبوونـــی خۆتا وجودی یار بەدی دەكـــەی، لە توانەوەی خۆتا دەگەیتە خزمەتی چرای هەمیشـــە درەوشاوە! لە فەرمانی عەقـــڵ دەردەچیتو دەبیتە غوڵامی دڵێك كـــە ناتوانی هەرگیز موخالەفەی بكەی!

لەهەر جێیەك هەڵێ خورشیدی عیشقی گوڵ ڕوخان

ئەگەر عەقڵی ببێ، لەو جێگە ئاونگی عەقڵ چی بكا؟ «مەحوی»

لەبەر دەرگای كۆشـــكی ئەوین ڕاوەســـتە لەســـەریەك پێ، تا گوێـــت لە نـــاوی خۆت دەبێ، تا دەگەیتە ئـــەو مەقامەی یار بە ناوی خۆی بانگت دەكات، ئەوكات نەشئەی خۆشییەك ڕوودەكاتە دڵـــت، كە هەرگیز وەها خۆشـــییەكت هەســـت پـــێ نەكردبێت!

ڕابوردنی ناوی تۆ، بەسەرزاری یاردا ئاوازی ڕۆحە!
تۆیەك دەیان ساڵە وەکو پوشو پەڵاشی پەرێزێکی دێم، قرچە
لە جگەرتەوە دێ، بەدەم هەناسەی یارەوە دەکەویتە سەما!

لەبەر زارو نەزاری بوومە وەك پوش
دە ئەمجا، ڕابوێرە، من بە زارا! «مەحوی»

گەر بگەیتە بەردەرگا، ئیدی، خۆڵی ئەو ڕاگوزەرە بە ئاوی
حەیات ناگۆڕێتەوە!
ئەوێ بۆ ئەهلی دڵو دەروێشانی تەریقەتی پەروانە، خەونی
تەمەنو خەرمانی زەمەنو مونتەهای ئەمەلە!
من چی بکەم لە حەیاتی بێ تۆیی، لە وجودی بێوجودی
دوور لە نیشتمانی ڕۆح!

«خضر» ئەگەر چاوی حەیاتی بڕییە ئاوی حەیات
من لە خاکی دەری جانانەمە، هەر چاوی حەیات! «مەحوی»

ڕێگای گەیشتن بەو خاکە تولانییە، کەسێك پەروەردەی
ئادابی ئەوین نەبێو لە کورەی ناری عیشقا هەڵنەقرچابێ،
ناتوانێ بیگاتێ!
دەبێت وێڵی دەشتو دەربێ، مەجنون ئاسا لە کێوو هەردا
بۆ لەیلای خۆی وێڵ بێ، دەبێ تەرکی دنیا بکاتو لە مرۆڤەکان
تارابێو جگە لە یاری خۆی چاوی کەسی دی نەبینێ!

بەجێ نایا دەبێ ڕوکەینە سارا
حەقی ئادابی مەجنونی لە شارا «مەحوی»

ئەو ئادابە ئەستەمە ئەداکردنی، ئەوین دڵی پاكو سینەی سافو پێڵوی شەرمنی دەوێ، ئاهی ساردو ناخی گەرمو جەرگی سوتاوی دەوێ، بەرامبەر بە جەمالی حەقیقی توانەوەو تەسلیم بوونی دەوێ! بێ دەنگی، ملكەچی، خزمەتكاری، بەخشینی ڕۆح بێ سێو دوو لە سەرەتا ئادابەكانی ئەوینن!!

گفتوگۆ بە زمانی ڕۆح، چرپە بە زمانی پەپوولە، نیگا بە چاوی گوڵ، نەرمی بە وێنەی سروە، ئەمانە سیمای ئەویندارن!

ئای كە سەختە ئازیزم، وانەی ئەم حوجرەیە موتاڵای زۆری دەوێ!

تا من دەبمە خاكو تۆ تەشریف دێنیو پێ دەنێی بەسەرما زۆری دەوێت!!

لەڕێی ئەو شۆخەدا خۆم كردە خاكو پێی نەنا پێ ما
دەسا خاكی هەموو عالەم
بەسەر خۆما نەكەم چی بكەم؟! «مەحوی»

من دەزانم بە هەڵە ڕێمكەوتە دیوانی تۆ ئەی شازادەی مەملەكەتی ئەوین!

ڕاوەستانی من لەبەر دەرگای تۆ هیچ مەعقول نییە، وەلێ چی بكەم من خۆ بە عەقڵ شەیدات نەبووم، هەر لە دووری ڕا لەگەڵ پێڵاوەكانمدا عەقڵم فڕێ داو ئیدی ئاوڕم بۆلا نەدایەوە!

بــرا، مـــەردم دەویٚ عـەقڵی نـەلـەنگیٚ
بـە لـەنـجـەی نــازو عـیـشـوەی نـەونـەمـامـان «مەحوی»

خۆمنیش خەیاڵی هاتنە نێو دیوانم لە مێشکدا نەبوو، من جگە لە پاسەوانو خزمەتکارێك، هیچی دیم بە ئاوات نەدەخواست!

من دەمویست تەنها بەرماڵەکەم لەبەر دەرگای تۆدا ڕابخەمو بە گۆچانێكو جلو بەرگێکی شڕەوە بە پێڵوی چاوەکانم گەردی بەرپێیەکانت بماڵم!

ڕۆژانـــە ئەگەر پەرداخێك ئاوو لەتیٚ نانـــی ڕەقت پیٚ دابام، ئیدی بەسم بوو!

من بە بوونی تۆ ژیانم بەردەوام دەبێت!

توخوا مەڕۆ.. با ژیانی من هەر بەردەوام بێت، تۆ بڕۆی من ئیدی دەمرم!

من بەس دەمویست لە جوملەی یارانی تۆم قبوڵ بفەرمووی، ئەگەر منیش حەددی ئەوەم هەیە!!

چونکە هەموو کەسێك شایانی ئەوە نییە ڕۆحی قوربانی تۆ بکات!

بیٚ حیسابن کوشتەیی پەیکانی غەمزەی چاوەکەت
گەر وەکو ئەمثالی ئێمە بێنە سەر حەددو حیساب «ئەدەب»

حەزرەتی شـــەم، لەم دەروێشـــە ســـالیکە بیٚ ســـلوکەی خۆت خۆشبە، هێشتا ئادابی ئەوین فێر نەبووە!

بەڵێنت پیٚ دەدەم ئیدی جگە لە ملکەچبوون، چیدی لە من

نەبینی! لەمەودوا..

گلە ناکەم ئەوەندەی دەنکە جۆیی
ئەگەر کەللەی سەریشم پڕلە کاکەی «نالی»

ئیدی هەرچیت دەوێ بیبە، هەرچیت پێ خۆشە بیکە، چیدی نابیسی بڵێم:

هەرچیبووم بردی بەتاڵان تورکی مەستی چاوەکەت
تاقەتو سەبرو قەرارم پێ نەما تاڵان بەسە
ئاورت بەردا دڵو گیانی «حەقیقی»چاوەکەم
دەردی بێ دەرمانە عیشقت، دەردی بێ دەرمان بەسە! «حەقیقی»

نا، ئیدی وشەی بەسە لە من نابیسی!! هەرگیز...

مەرگی بەر دەرگاکەی تۆم لە تەختی پاشایەتی لا گەورەترە، تۆ گیان دەبەخشی بە ڕۆحم، من بێ تۆ ڕۆحم مردووە، چ جای لاشەم!

ئەو دەردەی تۆ دەهێنێتە عیادەم من بەڕۆحم سەودای دەکەم

هەربە ئومێدی عەیادەت، بەڵکە جارێ بێتە لام
من، ئەگەر چی بشمرم، پێم خۆشە ئەم بیمارییە «نالی»

هەرکەسێکیش مزگێنیی هاتنی تۆم پێ بدا من سەروەتو ماڵی هەموو بە موژدانە دەدەمێ، چونکە دوای هاتنی تۆ من لە خۆشیدا شاگەشکە دەبم، لە خۆشیدا ڕۆحم دەسپێرم!

بە ڕووخۆشی کە فەرموویە،
دەبێ «ناری» عەیادەت کەم
ئەوا مردم لە خۆشیدا، لە خۆشی ئەو نەخۆشینە



# ناڵەی جودایی

توخوا خۆت بیڵێ، نەونەمامی نۆ
مردن خۆشترە، یا دووری لە تۆ؟؟

«فۆلکلۆر»

لەو هەنگاوانە ستەمکارتر نەبوون، کە لە تۆیان دابڕیم، لەو هەنگاوانەش بەرزو پیرۆزتر نین، کە جارێکی دی، منیان بە دیداری تۆ شاد کرد!

لەگەڵ دەرکەوتنی نوری تۆدا، دڵی شەیدام، دەکەوێتە خورپە، ڕۆح وەك تەیری نێو قەفەس، دەکەوێتە سەما....

بەڵام خورپەی تەواوی دڵ، لەگەڵ هەنگاوی ئەودایە
که سەرتاپا، لە ئاوازی بەهەشتی خواوە پەیدایە «هەردی»

ئەو هەنگاوانە لەگەڵ خۆیاندا ڕێگای پڕ دڕکوداڵی دووری دەپێچنەوەو لەدۆزەخی تەنیاییو زیندانی غوربەتو عەزابی بێتۆیی ڕزگارم دەکەن!

من بە بیستنی سڵاوێکی تۆ، شاگەشکە دەبم، چ جای جەنابتان بە لوتفو کەرەمی خۆتان، تەشریف بهێننە دیوانی غوڵامی خۆتان!!

قاصیدێ گەر بێ، لە تۆ بێنێ سەلامو بێتە لام
ژێری کەوشی ماچ دەکەم قوربان، بە تۆزو گەردەوە «صافی»

ئەی هاوار، منی غوڵام چۆن توانیم پشت لە تەختی شاهانەی تۆ بکەم ئەی شازادەکەم، لە کاتێکدا جگە لە من، کەس نەیتوانیوە ببێتە غوڵامی بەردەرگانەکەت...

گەر غوڵامیم پێ کەرەمکا، پادشاهیم کەی دەوێ
جێم لە بەردەرگا نەبێ، ڕوتبەو نیشانم بۆچییە «صافی»

تۆ سروەی ڕۆحو لەزەتی ژیانی، تۆ ئەو کەسەی کە لە نیگای تۆوە، دنیا دەبینم، تۆش هەر بەو شێوەیەی دەبینی، کە لە منەوە دیارە، چون تۆ بەگلێنەکانی من دەڕوانی!

ئازیزم، ئەو ڕۆژەی گەیشتمە زیارەتی بالآت، پێت گوتم: ئێرە چەند خۆشە!!

نازدارەکەم، ئەوە هەستی دڵەو زمانی ڕۆح! لەو شوێنە خۆشتر نییە، کە یاری خۆشەویستی لێیە، ئیدی ئەو شوێنە، هەر شوێنێك بێت!

بە گەیشتنی مەوکیبی شاهانەت، ئیدی شەماڵی عەنبەربۆی هەناسەت ڕۆحم مەستەکا، سەفا دەبەخشێ بە ناخم!

کە دەگەمە حزوورت، لە قوتابخانەی ئەوینی تۆدا، چۆك دادەدەم، وانەی ئەوینی پاكو عیشقی حەقیقی دەخوێنم، لەوێدا لە جیهانە گەورەکەی خۆشەویستی پاكو ئەوینی بەرزو شکۆداردا لە زبڵوزاكو زەلکاوی دنیاویستی، پاك دەبمەوەو غەرقی دەریای نوردەبم! ڕۆمی دەڵێت: ئەوەی کراسێکی لە عیشقدا دڕاندبێ، ئەوا لە هەموو تەماعو خەوشێك پاك بووەتەوە!

لەوێدا لە دەرگای دڵەوە دەچمە نێو مەملەکەتی ئەوین!

لەو مەملەکەتەدا مرۆڤەکان تەنها وێڵی ڕۆحن نەك جەستە، چونکە هەموو دەزانن ئەوەی وێڵی جەستە بێت، هەرگیز لە ڕۆح تێناگات!

ئەوەی تەنها بە زمانی لاشە بدوێ، هەرگیز فێری زمانی ڕۆح نابێت!

لەوێدا بەندە جگە لە تۆ شوغلی شاغیلی نییە!

هەمووعالەم بەکەسبوکاری مەشغوڵن ئەمما بەندە

هەمیشە عاشقی ڕوتم ، شەهیدی چاوی شەهلاتم

«ئەحمەد موختار»

ئەو ساتانەی کە وەکو پەروانە بە دەوری چرای ڕوخسارتا دەخولێمەوە، هەموو ئاواتم گەیشتنە بە ئامێزی گەرمت!

ئای لەو ساتانەی کە وەکو پەروانە، خۆت دەخزێنیتە ئامێزی گەرمی یارەوە!

ئای لە چێژو لەزەتی ڕۆح!

تۆم لابی، بەهاری دەگەڕێ پاییزی عومرم

لاشم نەبی تۆ، پاییزە عومرم لە بەهارا «کوردۆ»

ئازیزم گرنگ نییە لە کوێیت، گرنگ ئەوەیە لەژێر سێبەری کەپری خۆشەویستی یاردا، چرکەکانی ژیانت بگوزەری! چونکە تێپەڕبوونی چرکەکانی تەمەن، دوور لە هەڵمی هەناسەت مردنە، هەر ساتەو مردنێکی جیاواز، چونکە مردنی عاشقان، یەك جۆر نییە، ڕۆژی دەیان جار دەمرن، تا دەگەن بە زیندەگیی ڕۆح!

سەختترینو دژوارترین ساتەکانی ژیان، ئەو ساتەیە کە لەگەڵ ئەو کەسەدا دەژی، کە کەس هێندەی ئەو خۆشی ناوێی‌و تۆش کەست هێندەی ئەو خۆشناوێ، وەلێ لەناکاو خۆت بە تەنیای تەنیا دەبینیتەوە!

من ئێستاش نازانم چۆن توانیم ماڵاواییت لێ بکەم، ئەو پەنجانە چۆن هەڵنەوەرین کە دوعاخوازییان لە تۆ کرد!

مافی خۆتە سزام بدەیت، نەدەبوا من هەرگیز جێت بێڵم..

لە بەینی ئێمە شەرت وابوو، جودایی یەك نەکەین هەرگیز

وەفای عەهدت نەبوو قوربان، بەجێتهێشتم بە تەنیایی

«صافی»

بەڵام خودا دەیزانێ لەگەڵ ئاوابوونی خۆری ئەو ئێوارەیەدا، ئەو کاتەی بۆ دواجار ئاوڕم دایەوەو دوا سەرنجم لە سیمای نورینت دا، ئیدی چیم بەسەرهات!

چۆن گڕی جودایی وەك گڕەی چلەی هاوین چرۆی حەزو ئاواتو خۆزگەکانی یەك یەك هەڵدەپڕوکاندم!!

بۆ وادەزانی، جودایی هێندە ئاسانە؟

هیجرانو دووریی تۆ نەیهێشتم ئەزیزم، تاسەو چاوەڕوانی دیدار، سەبرو قەراری بردم بەتاڵان!

عومری من سوتا، لەنێو کورەی غەمی هیجرو فیراق

کەیلی مەیلو دەردی تاسەو ئیشتیاق «کەمەندی»

من بێ تۆ بەخودی خۆشم نابەڵەدم، بێ تۆ هەست دەکەم هۆیەك بۆ وجودی من نییە! ئیدی من کارێکم نامێنێ، وشەیەك نامێنێ بیدرکێنم، بێ تۆ، بۆ کێ بدوێم؟ چی بڵێمو باسی چی بکەم؟!

هەتا لەو یاری دەمسازە جودا مام
وەکو نەی بێ نەوا، کەوتووم‌و بێدەنگ «مەحوی»

بەڵام توخودا ئیدی بە دەردی جودایی سزام مەدە، تاڵاوی دووری مەکە بە گەرووما، چونکە هیچ شتێك هێندەی جودایی تاڵ‌و دژوار نییە، هەرچی دەتەوێت بیکە، جگە لە هیجران، توخودا ئیدی کاری وا نەکەی!

تۆ بە لوتفی خۆت بمبەخشە، من چیم هەیە بیدەم لە کەفارەتی گوناهەکانمدا، جگە لە ڕۆحێك کە هەرگیز بۆ سەودای ڕیزوانی تۆ ناشێ!

منی گەدا، چیم هەیە بیبەخشم بە تۆ، سەرمایەی من تەنها ئەوینی تۆیە!

ئازیزم تۆ دەردو دەرمانی منی، عیللەت‌و شیفای منی، گەر نەیەی بۆلام، من لە چاوەڕوانی‌و تەنیاییدا دەمرم!

گوڵەندام، ئەی تەنافی گەردنم، زوڵفی پەرێشانت
عیلاجێ! چارەیێ، ڕوحمێ، ئەمان دەستم بە دامانت

«وەفایی»

من بەرگەی هیجران ناگرم، سەحەر لە ناڵەی جودابیم بێزاربوو، مانگە شەو بەزەیی بە گریانی مندا دێتەوە، گەر تۆ بەزەییت بە مندا نەیەتەوە، ئیدی خۆ من جگە لە تۆ کەسم نییە!

ڕێگەی چاوەڕوانی بەرنادەم، لە هاتنت نائومێد نابم، گەر لە سەرەمەرگیشا تەشریفت بگات، شادم بەوەی ڕۆحم بکەمە شاباشی هاتنت!

ڕەحمێ بکە ئازیزم بە دیدەی تەڕو جەرگی برژاوو ڕەنگی زەردو دڵی بریندارم، من نەخۆش‌و تۆش حەکیمی منی، دەرمانی دەردی من تەنها لای تۆیە، ئەی مەرهەمی زام‌و برینم.

دڵ نەخۆشی دەردی هیجرە، جانی جانانم وەرە
لەت لەتە جەرگو هەناوم، ماهی تابانم وەرە
عیللەتی دەردو شیفاکەم وا بە لێوی شەککەرت
مایەی ژین‌و حەیاتم، دەردودەرمانم وەرە

«تاهیر بەگی جاف»

دەستم بەدامێنت، تەنها بۆ هەواڵپرسینی نەخۆشەکەی خۆت، سەرێ لە کوڵبەی ئەحزانی ئەم غوڵامەی خۆت بدە، تەنها نیگایەك بە تیلەی چاوەکانت، بە گەنجی قارون‌و سیحری هاروت‌و ماروت نادەم.

شەکوای دڵ‌و ئەرزوحاڵی ڕۆحە، شازادەکەم................،
چی دەبێ جارێ داوام قبوڵ بفەرمووی..

بۆ هەواڵپرسی، نەخۆشی خۆت، چییە گەر یەك دەمێ
یا لەبەر خوا، یا لەبەر ڕەغمی ڕەقیبانت وەرە

«صافی»

جگە لە خشەی گەڵای وەریو کە باخەوانە ڕدێن چەرمووەکە، کۆی دەکردنەوە، دەنگێکی دی نەدەبیسـتـرا، ئەو ساڵەهای ساڵە گەڵای زەرد کۆدەکاتەوەو ڕۆژەکانی تەمەنیشی پەرشو بڵاو..

گــــەڵاڕێـــــزان گــولْــی بــاخـــانــی دابــا
بــــەهــــارێ دیــکــە دێ ئـــەم داخـــــە لابـا
هــەنـاســەی بــاخــەوانــی پــیــرە دەیــگـوت!
هـــــــەزاران خـــۆزگـــە ژیـــنـــی مـــنوەهــابــا!

«شەریف»

بەڵام شـــازادەکەم من شـــادم بـــەوەی گەڵاکانـــی تەمەنم بۆ گەیشتن بە بەهاری مەملەکەتەکەی تۆ بەخشی!

دەزانم لە جێی هەموو گەڵایەکی وەریو گوڵاڵەیەکی ســوورم پێ دەبەخشی!

ئیدی هەناســـە بۆ ڕۆژانی تەمەنم هەڵناکێشـــم، بە عومری بابردووی نازانم!

ئەو ڕۆژانەی من گەڵای تەمەنم دەوەراند، لە چاوەڕوانی تۆدا وەستابووم، چما گەیشتن بە تۆ هێندە ئاسانە؟

گەیشـــتن بە مێرگی ئاواتو کانیاوی حەزو باوەشـــی هەستو نەســـتو ســـۆزو یانـــەی دڵ، ئەگـــەر لـــە دوا ســـاتەکانی ژیانو دواهەناسەکانی تەمەنیشدا بێت، مورادێکی هێندە بەرزە، بەهای بە هەموو تەمەن سەودا ناکرێ!

**ئـای کـه چـەنـد خـۆشـە ژیـانو عـومـرم**

**لـە خـاکو پـای تـۆ، گـیـان دەرچـێ بمرم**

«وەلی دێوانە»

بە گەیشـتنم بە تۆ، گەیشـتمە ئەو دەڤـەرەی کە ئیدی نە خۆری ئاوا دەبێتو نە بۆنی بارانی لێ دەبڕێ..

لە نێوەڕاسـتی بەهاردا لە نێو گوڵسـتانو گوڵـزاری گوڵاوو ڕێحانەدا بۆ بۆنی تۆ دەگەڕام..

لە نێو زیخی شـۆڕاوی نێو کانیو چەمی بەفراودا، بۆ نیگای پاکو دڵی شۆڕاوت دەگەڕام..

لە نێو ناڵەو چریکەی ڕەوە قولینگەکانی گەرمیانو کوێستاندا، بۆ ئاوازی تۆ دەگەڕام!

شیعرم نوسیو چیرۆکم داناو بوخچەیەکم پڕکرد لە یادگاری!

بڕیارم دا بۆ تۆ نەبێ بۆ کەسی نەخوێنمەوە!

تەنها بۆ ئەو شوێنە دەگەڕام کە تۆی لێ دەژی.....

ئـەو شـوێنەم بەلاوە گرنگ نەبوو کـە خۆمی تێدا دەژیم، چونکە دەمزانی بە هاتنی تۆ هەموو شتێك دەگۆڕێ!

**چەندە خۆشە «حەمدی»، جارێ بێتە ئەم وێرانەیە**

**جا دەبێتە قەصری جەننەت، کوڵبەی ئەحزانی من**

ئەگـەر هەمـوو عومری فانـیو باقیم بکەمە شاباشـی ئەو ڕۆژەی تەشریفت هێنا....

هێشتا ناتوانم لەسەر ئادابی مەحەببەتو مەراسیمی ئەوین،

دڵۆپێك لە دەریای خۆشەویستیم دەربڕم!

گــەر تۆ نەبای ڕۆحم بە کێ ئاشــنا باو، لــە لای کێ وانەی ئەوینی خوێندبا، کێ لە تاریکستانی عەدەم دەستەکانی گرتبامو ببوایە بە هاودەمی ڕۆحم!؟

من حەکایەتی دڵم بۆ کێ باسکردبا؟

کێ فرمێسکەکانی بۆ سڕیبامو ئارامی ببەخشیایە بە ناخم؟

شەوانە دەردی دڵو شەکوای ڕۆحم بۆ کێ بەیان کردبا!

کێ پەڕاوی دڵی منی دەکردەوەو دێڕبەدێڕی دەخوێندەوە!

لەگەڵ کێدا فرمێســکم ڕشــتباو بە ڕووی کێــدا لە ناخەوە پێکەنیبام!

گەیشتن بە تۆ سانا نەبوو، شازادەکەی دەڤەری ڕۆحم!

ســەیرن ئەوانەی وادەزانن ئەویندارى هێندە ئاسانە! نازانم چۆن دەتوانن ناوی عیشقو ئەوین بهێنن!؟

ئــەوان جگە لەو نــاوە هیچی دی نازانن! چمــا ئەوان بۆنی عیشقیان کردووە؟ نا هەرگیز....!

تەنها ســـروەیەکی گوڵاوی ئەوین، مرۆڤ مەست دەکاتو بە جیهانێکی ئەفسوناوی ئاشنا دەکا!

جیهانێك شوێنو جێگای بۆ نییە!

تۆ لە هەر شوێنێ بووی من لەوێم!

بۆ هەر شوێنێ بچی هاودەمتم، ئیدی ناتوانم چرکەیەك لێت جودابم!

دوای زەمەنێك لەناڵەی جودایی‌و غوربەتی ڕۆح‌و تەنیایی دڵ، ئیدی بێ هاودەمی هەستو نەستم نامەوێت هەناسە بدەم!

دوور لــە نیــگای تۆ کوێــرو دوور لە چرپەی تــۆ کەڕو بێ گفتوگۆی شیرینی تۆ لاڵم!

مــن ئیدی ناتوانم بــێ فەرمانی ئیمپراتۆری دڵم بســرەوم، هەمیشە دەستەونەزەر بۆ بەخشینی ڕۆحم لە خزمەتتدام.

لــە بــۆ وەصــلــی جــەمــاڵــی یــاری کــوردی
ئــەگــەر ڕۆحــم نــــەدەم، نــامــەردم ئــەمڕۆ

ژیان لە خزمەتی تۆدا حەلاوەتی ڕۆح‌و ســکونەتی سەکینەی ئارامی‌و دڵنیایی‌و ئیتمینانی حەقیقییە!

هەروەکو ڕۆمی دەڵێت: گەر شەکر دەیزانی عیشقی تۆ چەند شــیرینە، لە شــەرما دەبووە دڵۆپێك ئاوو شــانازی بە شیرینی خۆیەوە نەدەکرد!

ئای خودایە گرتنەبــەری ڕێگەی ئەوین چەند دژوارە، وەلێ لە یەکەم ســاتی گەیشتنە نێو مەملەکەتی ئەوین هەموو تاڵی‌و ناڕەحەتییەکان بیر دەچنەوە!

بارێــك خەم‌و پەژارەو هەناســەی ســاردو دەردی بێ تۆیی‌و چیرۆکی تەنیاییم ئامادە کردبوو، وەلێ کە تەشریفتان هێنا لە خۆشیدا هیچم وەبیر نەما!

لە نێو خەندەکانی تۆدا هەموو توانەوە!
بە هاتنی تۆ ئیتر من خەمێکم نەما!

**که خضر ئەو خاکو خۆڵەی بەردەری دی**
**وتی تۆ خاکی، یا ئاوی حەیاتی**

«مەحوی»

لێرەدا ژیان ڕەنگێکی دیو سەعادەت وێنەیەکی دی هەیە، لێرەدا هەردووکمان بۆ یەك ئاراستە دەڕوانینو بە یەك ئاواز پێ دەکەنینو بۆ یەك ئامانج فرمێسك دەڕێژین، لێرەدا خودی خۆمان لە یاد دەکەینو لە یەکتردا دەتوێینەوە.

ئیدی ناتوانین بێ یەکتر هەناسە بدەینو پەرداخێك بخەینە سەر لێومان!

شەوانە بێ بۆنی کراسی یوسفینت، خەو ناچێتە چاوانم!

ئەوینی منو تۆ ناسنامەی ڕۆحە، یەك چرکە قبوڵی غەفڵەت ناکا!!

جگە لە تۆ کەس نەیتوانی بێتو لەسەر شەپۆلی ڕۆحم شادەمارەکانی دڵم تەیکاو بە ناخمدا ڕۆبچێ!

کەس نەیتوانی گرێی دڵم بکاتەوەو وەکو ئیمپراتۆرێکی سەرکەش ئاڵای ئەوین لە نێوەڕاستی دڵمدا بچەقێنێ!

منو تۆ زادەی یەك خاکو خۆڵو، بۆی یەك بەهارو شەپۆلی یەك دەریاین!

لەگەڵ تۆدا خۆم خۆشەوێ! دڵخۆشم بە ترپەی دڵم، ژیانم لا شیرینە!

چونکە لە بەهەشتی دڵی تۆدا دەژیم!

هەرگیز نیشتمانێك نییە لەو دڵە گەورەتر بێ کە بێ سنور خۆشی دەوێی!

**کە شەیتان تاقی میحرابی بڕۆی تۆی دی وتی: یارەب**
**لە سوجدەی حەزرەتی ئادەم سەری خۆم بۆ چ داناوە**

«حاجی قادری کۆیی»

لەبەر تەوقی فیراقو ئیشتیاقت
فەراقی کرد، دڵم تۆقی بە زاری
بە جاریٚ بمکوژە، خوێنم بڕێژە
خەلاسم کە، لە دەردی ئینتیزاری

«وەفایی»

# مەتڵەبی دڵ



بێدەنگ مەبە، لە چریکەی دەنگت مەحروومم مەکە!

لەگـەڵ بێدە نگی تۆدا، ئیدی من، گوێم لە ترپەی دڵیشـم نابێ!

ئەگەر قرچەی ناخو ڕێژنەی فرمێسکەکانم نەبن، هەست بە زیندوویی خۆشم ناکەم!

خەریکم وەکو منداڵ، جگە لە گریان، زمانێکی دی نازانم، بۆ گوزارشت لە داوای دڵم!

ئاخر من ناتوانم، بڵێم: چیم دەوێو کێم دەوێ!

وەکـو نەی کونکونــە جەرگم، لە تــاو هیجرانی تۆ بۆیە

بە سـۆزی نەی دەسـووتێمو بە نەغمەی نــەی دەناڵێنم

«وەفایی»

چـۆن بتوانم، بڵێم: من لە تاسـەی چاوەڕوانیی کەسـێکدا دەسـووتێم، کە بێبەرامبەر خۆشی دەوێم، بەبێ هیچ داوایەك، تەنها خۆشی دەوێمو بەس!

بە کێ بڵێم، کە ئەگەر خەیاڵو ئەندێشەی دڵ نەبێ، ناتوانم چرکەیەك بژیم!

ئەگەر سـروەی هەناسـەت، لە بۆنی بارانــا، ئاوێتەی ڕۆحم نەبا، ئێستا دەمێك بوو، نێوم لە پەڕاوی ژیانا، سڕابووەوە!

دڵ ڕۆییــوه قوربــان، لــه وجــودم بــه خه‌یــاڵات
دایــم لــه ســه‌فه‌ردایه،   ئه‌گه‌رچــی لــه حه‌ضــه‌ردا

«تاهیر به‌گی جاف»

خۆ من گله‌یی، له عه‌زابی ڕۆحو ئه‌شــکه‌نجه‌ی دڵ ناکه‌م، با بگه‌مه دیدارت، با چاوم به کلی دیداری ڕوخسارت بڕێژم، ئیدی ئه‌و ئاوازه، با هه‌ر به‌رده‌وام بێت!

من گازنده‌یه‌کم له له‌یلای دڵم نییه!

یَــقــولــونَ لَــيــلــى عَــذَّبَــتــكَ بِــحُــبِّــهــا
أَلا حَــبَّــذا ذاكَ الــحَــبــيــبُ الــمُــعَــذِّبُ   «مجنون ليلى»

ئه‌مــه ته‌نهــا په‌یوه‌نــدیو ئالووده‌بوونی مرۆڤێــك نییه به مرۆڤێکه‌وه!

ئه‌مه ته‌نها داواکاریو تکایه‌کی ســۆزداریو هه‌ســتێکی کاتی نییه!!

ئــه‌وه مه‌تڵه‌بی دڵو حاجه‌تی ڕۆحو ئاوێته‌بوونی خوێنه، له شاده‌ماری مه‌حبووبدا!

ئه‌وه هه‌ناســه‌ی زینده‌گــیو ئاوێزانبوونی دوو ڕۆحه، که بێ یه‌کتر، ده‌مرنو ناژین!

ئه‌مه جیهانی ڕۆحه، لاشه هیچ مه‌قامێکی نییه لێره‌دا!

لێره‌دا، مه‌رهه‌می ڕۆح، ته‌نها ڕۆحه!

هه‌توانی دڵ بۆنی هه‌ناسه‌ی ئه‌وینداره!

سەد تەبیب هاتو عیلاجی ئەم برینانەی نەکرد
تۆ عیلاجی زەخمەکەم کە، سا بە ئامانم وەرە
گەر دەزانی، چەند پەشێوە حاڵەکەم، بۆ دیدەنت
سەد ئەوەندەی زوڵفەکانت، دڵ پەرێشانم وەرە «تاهیربەگی جاف»

وەها ئەوینێک، هەرگیز گۆرانی بەسەر نایەتو خۆری، هەرگیز ئاوا نابیّ!
گوڵزاری، هەرگیز زەرد نابیّو نوری، هەرگیز خامۆش نابیّ.

لە دنیادا، هەموو شت، قابیلی تەغییرو گۆڕانە
بە تەنیا حوسنی تۆو عەشقی منە، نەیدیوە تەغییریّ

«کەمالی»

دڵ ناتوانیّ، تاسەی عومری خۆی، بۆ کەس بدرکێنیّ، جگە لە تۆ!
ڕۆح ناتوانیّ، چرپەی ڕازی، بە گوێچکەی کەسدا بچرپێنیّ، جگە لە تۆ!
بیناییم، تروسکەیەك بەدی ناکات، پەپوولەی خەندەیەك، لەسەر خونچەی لێوم، نانیشێتەوە!
سروەی شادییەك، خۆی ناکات بە ژوورەکەمدا!
گەر تۆ نەبی، وشەکان ماڵاواییم لێدەکەنو شیعر نایەتە دیوەخانم!
گەر تۆ نەبی، من بۆ کیّ بنووسم؟!

گەر تۆ نەبای، لە چاوەڕوانیی کێدا، ئەستێرەم دەژماردو لە تاسەی کێدا، هەناسەم تێکەڵ بە بای خەزان دەکرد؟!

تۆم نەبای، من چاوەڕێی کێم کردبا، تا چیرۆکی تەمەنمی بۆ بگێڕمەوە؟!

ئەم عومرە عەزیزە، کە لە بۆت، نەقدو دراوە
سەد حەیفو درێغا، کە موسوڵمانی نەماوە
عومرێکی درێژە، بە خەیاڵی سەری زوڵفت
سەوداو پەرێشانەو سەودایەکی خاوە

«نالی»

دەزانم، ئەم هەستەی من، دڵۆپێکە لە دەریای بێبنی هەستو نەستی بێسنوورت!

دەزانم، دەترسێی!

لە لێدانی دڵ، دەترسێی...

دەترسێی، ئیدی نەتوانێ، چاوەڕێ بکات...

دەترسێی..... لە لێوەکانت دەترسێی!

دەترسێی، چیدی نەتوانێ، ڕازی ئەوین، بشارێتەوە!

دەترسێی، ئیدی گوێچکەکانت، لەدەست بدەی، چونکە ئەگەر چرپەی نازی نازداری دڵی، پێ نەژنەفی، ئیدی وتەیەکی دی، نابیسی!

سەیرە، گیانی من سەیرە!

لــه دنیایەکدا، جێمان نابێتــەوە، کە جێگای هەزاران هەزار کەسی تێدا دەبێتەوە!

لەو ڕۆژەوە تۆم ناســی، ئیدی نەمتوانی، جگە لە دڵی تۆ، لە هیچ شوێنێکدا ئۆقرە بگرم!

چــاوەکـــەم، کــەی بــێ زەمـــانــێ، زوو بــە زوو
دابــنــیــشــیــن بــێ غــەمــی دڵ، دوو بـــە دوو
دەفـــتـــەری ڕازی گــلـــەی ڕۆژی فـــیــراق
بــێــتــە مــەیــدانــی بــەیــانــۆ، مـــوو بــە مــوو
چــەنــدە خــۆشــە، بــۆ مـــنو تـــۆ پــێــکــەوە
وەك گــــوڵو بــولــبــول، بــەشــێــوەی ڕووبــــەڕوو

«ناری»

ئارام بگرە، شازادەکەم، وادەی لیقا نزیکە......
ژووانی ڕۆح، بە چرای ئەوین ڕووناکە......
ئینتیزاری وەسڵی یارو قدومی ئیمپڕاتۆڕی دڵە!
هەموو شەوێك، بە خەیاڵی ئاوازی تەشریفی تۆوە.....
خەو دەچێتە چاوەکانم!

لـــە گــوێــمــا دەنــگــی دەقــولــبــابــی دڵ دێ
خــەیــاڵـــــی یـــارەکـــەم، مــیــوانــە ئــەمــشــەو

«سالم»

# مێژووی من

وەرە گیانە، دوو چاوم، ماڵو جێتە
گلێنەی چاوەکانم، تۆزی ڕێتە
دەترسم؛ پێی نەزانی، پێت، کە دانێی
دڕووی برژانگی من، ئازاری پێتە

(بابا تاهیر)



مێژووی من، ئەو ڕۆژە دەستی پێکرد، کە گەیشتم بە تۆ، ئای چەند گرنگە؛ مرۆڤێك بۆ تۆ مێژوو بێت!

تۆ تەنها مرۆڤێکی ئاسایی نەبووی!

تۆ ئەو کەسە بووی، کە ملیۆنەها ساڵە، لە نێو ڕۆحی مندا دەژیای، بۆیە منیش وێڵی دیداری تۆ بووم!

ساتەکانی من، لەگەڵ تۆدا، بە ڕۆژو مانگ ناژمێردرێن، هەموو ساتێك لەگەڵ تۆدا، تەمەنێکی نوێیە!

ئێستا من، بەتەمەنترین مرۆڤی سەر زەویم!

تەمەنێك لە سایەی ئەوینێکی ئەبەدیدا!! تەمەنێك، کە هەرگیز دیاری ناکرێت! تەمەنێك، کە پیری ناناسێت، ئەوەی کە شەیدای مرۆڤێکی وەکو تۆ بێت، هەرگیز پیر نابێت! چ جای ئەوەی، تۆ شەیدای بیت...!

تۆ ئەی گوڵاوی شیعرو هەناسەی هەورو سەفای باران!

ئەی ئەلبومی خەونو میوەی بەهەشتو دەریای زیوو

نەسیمی فیردەوس!

لەو ساتەوە تۆم دیوە، گلێنەی چاوم لە نێو شەونمی فرمێسکەکانیدا، تەنها وێنەی تۆی شۆریوەتەوەو جگە لە تۆ، کەسی دی نابینێ!تۆ مرۆڤێکی بۆ هەموو وەرزەکان.

شەپۆلی هەنگوینی، شنەی گوڵاوی

چەپکە گوڵی هەمیشە بەهاری!

شەوچرای دیوەخانی دڵمی!

تۆ هێزی هەناسەو ترووسکەی دیدەو، سەبەبی وجودی منی!

خودایە، دەبێ ژیانی بێ ئەوین چۆن بێ؟

دەبێ مرۆڤەکان، بێ ئەوین چۆن بژین؟

من هەرگیز بێ ئەوین نەژیاوم....

بەڵام دڵنیام، ژیان بێ ئەویندارى ڕۆح، دۆزەخە!

بێ نووری ڕوخساری تۆ، ڕۆژم شەوو شەوگارم ڕەش‌و بێچرا دەبوو!

تـــــــرازووی زوڵــفــی ڕۆژو حـوسـنـی کێشا

تـــەفــاوت هـــەر لـــە ئـــەرزۆ، تـــا ســەمــا بــوو

خــەتــی تـــوڕڕەی شـکـسـتـەی بـۆیـە حــەل بــوو

لـە شــەودا کوڵمی بێ شــەم، شــەوچــرا بــوو «ناری»

ئـەو مـرۆڤـانـەی مـن دەمبینین، وەکـو پـارچـە شووشەی ڕەنگاوڕەنگ، تەنها لەبەر تیشکی خۆردا دەبریسکانەوە! تەنها تۆ بووی، لە تاریکایی شەودا، چل چرای دیوەخانی دڵم بووی!

لە سەرەتای شەوە تاریک‌و ساردەکانی زستانا، لەدایکبووی، تا باوەشی گەرم‌و دەریای میهرو خۆشەویستی‌و سۆزو ئەوین بی بۆ من!

خۆ گـەر بـاوەشـی سـۆزی تۆ نەبا، لە وەیشومەی شەوە ساردەکانی تەمەنما ڕەق هەڵدەهاتم!

هەڵمی هەناسەت نەبا، سینگم شەقی دەبـردو خوێن لە شادەمارەکانی دڵما، دەمەیی!

خەندەی تۆ نەبا، ئەستێرەیەك لە ئاسمانی مندا، نەیدەبریسكاند!

گوڵزاری وتە بەرزەكانی تۆ نەبا، بولبولێك لە باخچەی ڕۆحمدا نەیدەخوێند!

ئومێدی هاتنی تۆ نەبا، هەموو ئێوارەیەك لەگەڵ مانگا، ژوانم نەدەبەست!

یادی لەدایكبوونی تۆ نەبا، دەیان ساڵە چەپكە گوڵم بە برژانگی چاوم گرێ نـەدەداو، لە چاوەڕوانیتا، پرچی سپیم نەدەهۆنییەوە!

بمبەخشە، چەپكە گوڵی دەستم ژاكاو، گەڵای گوڵم زەردو بزركاو، لێوی گوڵم وشكو چاوی خونچەم شەرمنە!

ئەمە هەر ئەو چەپكە گوڵەیە، كە عەیامێكە بە دەستمەوەیەو زەمەنێكە خەزانی پاییز، دەستی ناوەتە گەردنیانو گڕی هاوینی گەرمەسێریش، هەڵیان دەقرچێنێ!!

گـــەر لـــە هــاتــنــت ئـــەبـــووم ئـــاگـــادار
ئــەمــچــانــد لـــە ڕێـــتـــا، گـــوڵو ڕێـحـانــە
نـــەم ئـەهـێـشـت، كــە پــێ بـخـەیـتـە ســەر خـاك
چــاوم ئــەكــردە فــەرشــی پــێــت گـیـانـە «كـەمـالـی»

نامەوێت دەستبەرداری ئەو چەپكە گوڵەبم......

ئەوە هاودەمی تەنیاییو هەمرازی ڕازو نهێنیی ئەوینی ئێمەیە!

خۆ ئێمە ناچین، بە بینینی گوڵێكی گەش، گوڵە وشكەكان

فەرامۆشکەین!

ئەوان عەبیری ڕۆحیان، بەخشی بە ئێمە، بۆنی گوڵاویان، تێکەڵ بە ڕۆحمان بوو!

ئێستا، ئێمە بۆنی ئەوینمان گرتووە، دەبێت سەرچاوەی ئەو گوڵاوە کوێ بێت؟

تۆ بڵێی فریشتەکان، لە بەهەشتەوە نەیهێنن!!

گوڵاوێك لێوانلێو لە پاکیو توهرو وەفاو متمانە!

ئای لە گەورەیی ئەو خۆشەویستەی، لە خۆت زیاتر متمانەت پێیەتی!

بۆنو ڕەنگی متمانە نەمرە!! هەرگیز کاڵ نابێتەوە!

ئازیزم، ئێستا نیوەشەوێکی درەنگە، خـەزان بە چارۆکە ڕەشەکەی گەڵای دارەکان بەبا دەکا!

وەیشومە پرچی دارەکان دەڕنێتەوە......

لێزمەی بارانێکی بەهێزە، یەکێکە لە شەوە ساردەکان، وەلێ دڵنیام، ئەم شەوانە، دەبێ کۆتاییان پێبێت!

خۆ وەرز هەر گەڵاڕێزانو شەوان هەر وەیشومە نابن!

هەزاران گەڵای سەوز دەچنەوە بە گژ خەزانا،

بارانەکەش ڕووی گوڵەکان دەشواتەوەو ناخی باخەکان پاك دەشۆرێ!

ئەمە سەمای عومرو دەوامی ژیانە، ئازیزم،....

ئەمە سەمفۆنیای ئاهەنگی ئەوینی ئەبەدییە....

چما نازانی، ئەمشەو شەوی لەدایکبوونی تۆیە!؟


ڕێگای ئەوین
وتم: با لـەم دەرو لەم کۆیەدا، ئانێ سـکونەت کەم
وتی: عاشق دەبێ هەر دەربەدەربێ، کۆ بە کۆ بڕوات
١٦٧

سـەختە ئەو ڕێگایە، عەزابە سلوکی ئەو تەریقەتە، کەشکۆڵی پڕ ئەسـرینو ئاهو حەسـرەتی دەوێ، سـوتانی نیوەشەوو ناڵەی سەحەری دەوێ، سەرفی نەزەری لە هەموو مەتاعی دونیای دەنیو فەرامۆشـکردنی جەمعـی مەخلوقاتی دەوێ، تا بگەی بە ئۆخژنی دڵو سەعادەتی گیانو لەزەتی ڕوح!

ئیـدی بە هیچ لایەکدا ئاوڕ نادەیتەوە! ئەوە ڕێگای ئەوینە.. خۆت ئیختیاری دەکەی؛ بۆئەوەی بە گڕی ئەو ئەوینە، زاخاوی مەعدەنی ئینسانیت بکەی.. بسوتێی، تا دەبیتە پشکۆ، لە دەریای فرمێسـکی عیشقو تاسـەو ئینتیزارا، خۆت بسمیل بکەیو دڵت بکەیتە بەفر!

بـێ ئەوەی داوای هیـچ بکەی لە یار، تۆ تەنها دەبەخشـی، ئەگەر بە کەڵکی بەخشین بێی! حەددی داواکردنت نییە!

لـەبـەر تـۆ دەمـرمو نـاژیـم لـەبـەر خـۆم
دەسـوتـێـم وەك شـەمو قـەت نـایـە بـۆسـۆم
ئـەمـن ئـاورم لـە خـۆم بـەردا لـەبـەر تۆ
کـەچـی تـۆ خـۆڵـی خـۆم نـاکـەی وەسـەر خـۆم
«سەیید»

تـۆ ئیدی موڵکی خـۆت نیت، شـازادەی مەملەکەتی ئەوین خەزنـەداری خەزێنـەی دڵو بەختی تۆیە نابـێ کەس ئاوازی دەنگت ببیسێ جگە لە ئەو، نابێ کەس گوێبیستی هەناسەت بێ

جگە لە ئەو، تۆ تەنها هی ئەویو بەس!

لەگــەڵ کێ قســە دەکەی، لەگــەڵ کێ پێ دەکەنــی، بۆ کێ دەڕوانی جگە لە یار، بۆ کەسێکی دی وجودی هەس؟!

خەیاڵی زولفی دەرناچێ لە دڵ، تا دەرنەچێ ڕۆحم

سپێرراوە خەزێنەی بەختی ئێمە بەو سیامارە «مەحوی»

تا نەگەیشتبووی بە یار تۆ چی بووی؟! خۆت دەزانی، کە چی بوویت؟ دڵنیام هیچ نازانی!

تۆ جگە لەبەر دەروازەکەی ئەو، ئیدی نیشتمانێکت نییە! دەرگایــەك، کە هــەزاران ئەوینــدار، لەوێــدا ڕۆحی خۆیان بەخشی! بەڵام وەك سەعدی دەڵێ:

«مردن لەبەر دەرگای یار ئاسانە! نەمریو زیندوویی، جێی سەرسوڕمانە!»

مردن لــەو ڕێگایــەدا، ئاواتێکە بەدیهاتنــی خەونی هەموو ئەویندارانە!

کەسێ تۆ کوشتبێتت ڕۆژی مەحشەر زەحمەتی نادەن

ئەگەر وەك من لە ئەم دونیایە، سوتابێ لە هیجرانت «کوردی»

لــەو ڕۆژەوە، گەیشــتمە بەردەرگاکــەت، ئیــدی نەمتوانــی چرکەیەك دەستی لێ بەردەم؛ چونکە گەر وا بکەم دەمرم!

تۆ بەرگی فریشــتەت کردە بەرم، تۆ فێرت کردم چۆن بدوێم، تۆ وشە ئاڵتونییەکانت خستە سەر زارم، تۆ بۆنی بەهەشتت پێ بەخشیم!

تۆ بزەت خستە سەرلێوی وشکم! دەستت گرتم بەرەو ئاسمان!

تۆ ســۆمای چاوت ڕۆشن کردمەوە، تۆ کانیاویماریفەتت لە ناخمدا تەقاندەوە!

تۆ پێم بڵێ، من بە بێ ئەوین، چی بووم؟!

پێش ئەوەی بگەم بە تۆ، نەمدەزانی کەسێك دەبێتە هەموو کەســم! نەمدەزانی ڕۆژێك دەبێ، بێ ئەو کەســە ناتوانم بژیم، ناتوانم، لە دووری ئەو، ســاتێك ئۆقرە بگرم!نەمدەزانی ڕۆژێك دەبــێ لە هەموو دونیا غافــڵ دەبم جگە لە ئەو، ڕۆژێك دەبێ ناتوانم چاوتروکانێك فەرامۆشی بکەم!

ئەگەریەك لەمحە غافڵبم، لەشەوقی ماهی ڕوخسارت

لەحەشرا، بێ نەصیبی جەننەتو ڕوباری کەوسەربم «کوردی»

من پێش ئەوەی بگەم بە تۆ، هەزارو یەك خەمم هەبوو، کە گەیشــتم بە تۆ، ئیدی هیچم بیرنەما، دەمویســت، کە تۆ هاتی خەمــی دڵمت بۆ باس بکەم، بەڵام کە تۆ هاتی، من ئیدی چیت بۆ باس بکەم؛ چونکە بە هاتنی تۆ، ئیدی خەمی دڵم نەما!

من ئیدی وەکو حافزی شیرازی دەڵێ:

«نییە لەسەر لەوحی دڵم،

جگە لە ئەلفی قامەتی یار»

پێــم وایە کاتێك مــرۆڤ ڕێگای حەقیقی خــۆی دۆزییەوە، ئیدی ستەمە، ئەو ڕێگەیە نەگرێ؛ چونکە ئیدی بۆ کوێ دەچێ،

ئەگەر لەو ڕێگایە لا بدا؟!

لـــە بـــۆ وەســـڵـــی جـــەمـــاڵـــی یـــاری کـــوردی

ئـــەگـــەر ڕۆحـــــم نـــــەدەم نـــامـــــەردم ئـــەمـــڕۆ

یاری شـــیرینم، تۆ فێرت کـــردم، کە ڕێگـــەی ئەوین، ناڵەی نەیـــیو قرچەی دەروونی بەکوڵو خوێنـــاوی دەروونە، تۆ منت خستە سەر ڕێبازی شەمو پەروانە!

تا دڵ نەسووتێ دەم بە دەم، فانی نەبێ سەر تا قەدەم

پەروانە قەت ناگاتە شەم، ئاوایە ڕێگای عاشقان «وەفایی»

دەزانم تۆش شەوانە، لە کوڵبەی ئەحزانی خۆتا، گەرمەشینو مەراسیمی حوزنو ئەلەمی دووری، بەرپا دەکەی!

دووری لـــەو کەســـەی لـــە خـــۆت خۆشـــترت دەوێ، لە ناوی خۆت زێتر پێی ئاشـــنای، لە هەناسەت زێتر هەستی پێ دەکەی، زەحمەتە، زۆر زەحمەتە ئازیزم!!

دەزانـــم تۆ ناتوانی بێ ئەو کەســـە، درێـــژە بە ژیانت بدەی، دەزانم تۆ لە هەموو شتێ بێزاری، تەنانەت لە ڕۆحی خۆشت!

ئەگەر نایبەن لەگەڵ خۆتان، بەکوشتن ساعیلاجی کەن

کە وەڵڵا ئەو لە پاش ئێوە، لە ڕۆحی خۆشی بێزارە «کوردی»

دەزانم گڕی دووریو تاسەی دیدار، ژوورەکەی کردووی بە کوانوو!!

بەڵام نازدارەکەم، تۆ بە فرمێســکی چاوەکانت، عەرشی مەملەکەتی ئەوین دەشۆی، تا بۆ هەمیشە پاکو بێگەردو جوانو نەمربێ!

تــۆ ئەگەر خاوەنی ئەو دەروونە پــاكو دڵە بێگەردو ڕوحە بەرزە نەبای، نەدەبووی بە شازادەی مەملەكەتی ئەوین!

ئەویندار، تا نەبێتە گەردی بەرپێی یار، چۆن دەستی دەگاتە دامێنی!

بــرا ، تــا نــەبــیــە تــۆزو گــەردی بــەرپێی

بــە زەحــمــەت، چاكی ئــەو دامــانــە ئــەگــری «بێخود»

زۆر كەس بە حەســرەتی گەیشــتن بەو دامێنەوە ســووتانو نەگەیشتن، ئێستا كە تۆ ڕێگای ئەوینت گرتووەو یار مۆڵەتی داوە بێیتە حزوریو لە مەملەكەتی ئەوینی خۆیدا، تاجی شــاهانەت لەسەر نێ، ئیدی چی لەوە گەورەترە، كێ لە تۆ بەختەوەرترە!

دەس بە داوێنی ئەوین بووم، دەس نەگەییە دامەنی

ئێستە داماوم، كە ئەم دامانە، بەو دامانە چی؟! «سەید»

ڕێگای ئەوین؛ ڕێگایە بەرەو ژوانی ڕۆحو بەهەشــتی هەموو خۆزگــەو هیواو ئاواتەكان، خۆزگەم بــە ڕێبوارانی ئەم ڕێگایەو سالیكینی ئەم تەریقەتە پڕ نوورە!

تا نەبووری تۆ لەسەر ڕێ، ناخەیە مەیدانی عیشق

سەرلە پێش پێ دەبێ، لەم ڕێگەیە دانێی «أولا» «مەحوی»



# گەیشتن بە تۆ

دڵو دینی بە جارێ لێ ستاندم نێو نیگای چاوی
بە تیرێ دوو نیشانەی پێکەوە ئەو شۆخە پێکاوە
ئەگەرچی نامەوێ، من تۆبە بشکێنم خودا چ بکەم
هەموو جار ڕووڕەشی لای تۆم دەکا، ئەو پەرچەمە خاوە

ئەگــەر هەموو عومرم هەنگاوێك بێت، ئەوا بــەرەو لای تۆ هەنگاو دەنێم، چ فەزڵێکــی گەورەیە خودایە، کە دەتوانم هــەزاران هەنگاو بنێم بۆ حزووری یار! خۆ من ئەگەر تاســەی گەیشــتن بە دیوانی تۆ نەبێ، ناتوانم هەناسەیەکی عومرم بە ڕێکەم، شەوانە شەوبۆی هەناسەی تۆو میسکی دیدارت نەبێ، ناگەمە بەرەبەیانی ناڵەی ئەوینو گریانی سەحەرو پێشوازی ڕۆژێکی نوێم پێ ناکرێ!

هیــچ شــتێك نییە، بمبەســتێتەوە بەم ژیانەوە جگــە لە تۆ، هیچ ناسنامەیەك نییە، شوناسی من بێ جگە لە تۆ، هیچ نیشتمانێك نییە تیا بسرەوم، جگە لە دڵی تۆ!

من بەو شەماڵە دەژیم لە مەملەکەتەکەی تۆوە هەڵدەکا

بەســەر دڵدا لە قاپی فەیزەوە دێ نەشــئە، پەی دەر پەڕ

چ غەمزەی دیدە مەخمورێکە، ئەمشــەو کون دەکا ســینە «مەحوی»

لە هەموو شتێکدا تۆ دەبینم، لە هەموو هەنگاوێکمدا لەگەڵم دەژی، هەرچەنــدە من بۆلای تۆ دەچمو بۆ گەیشــتن بە تــۆ هەنگاو دەنێم، بەڵام تۆ لە خودی خۆم لێم نزیکتری!

هەســتکردن بــە وجــودی تــۆ، بەردەوامیم پــێ دەبەخشــێ، مانا دەبەخشــێ بــە ژیانــم، بێ تــۆ حیکمەتێك لــە بوونی مــن نامێنێ، بــێ تۆ ژیــان جگە لە عەبــەس چیدی نییــە! جگە لە باوەشــی تۆ، ئەمانێــك نییــە بــۆ ڕۆحــم، ئەگــەر جگە لــە مەملەکەتەکــەی تۆ، هــەر شــوێنێکی دیــم پێ خۆشــبێ، مــن هیچێ لــە ئەویــن نازانم!

فــەرزەن هەمــوو دونیامــنو عومــری خــزرم بوو

بــێ جەننەتــی ڕووی تــۆ، چ حەیاتێکــە، چ ژینــە «وەفایی»

عومری خدرو جامی جەم بە چی، ئەگەر دووربم لە تۆ، من دەسووتێم بۆ گەیشـــتن بە جەننەتی ڕوخســـاری تۆ، ســـەرو ماڵم دەکەمە ســـەودای جەماڵی تۆ، بێ تۆ، من هیچم نییە ئەگەر شـــەوقی دیدارو تاســـەی ڕۆژی لیقا نەبا، من لە پێناوی چیدا ڕۆژگاری ژیانم بەڕێ دەکرد؟ ئەگەر سالیکی ئەو تەریقەتە نەبام، ئێستا مەستو حەیرانی چی لاڕێیەك دەبووم؟!

ئەگەر شەوقی جەماڵی تۆ نەبێ، من مەستو حەیرانم!

لەبەرچی بۆتە بولبول گوڵ، چرا بۆ چ بۆتە پەروانە «وەفایی»

خۆ دەزانم گەیشـــتن بە تۆ ئاسان نییە، چما گەیشتن بە بەهەشتی ڕۆح، کەی ئاسان بووە!؟

ئەگەر ئێســـتا شەوانە گریان میوانی چاوەکانت بێو فرمێسك گوڵاو پرژێنی ڕومەتت بکاو ئاگر لە ســـینەت بڵێســـە بدا، بەڵام تۆ ســـەودای نیشـــتمانێك دەکەی، کە ئیدی گوڵ تیایدا ناوەرێو دڵ تیایدا ناشـــکێو خەم وجودی نامێنێ! ئیدی تێر بە چاوانت لە ڕوخســـاری ئەویندای خۆت دەڕوانی، ئیدی دووریو جودایيو تەنیایی دەبڕێتەوە!

بۆ ئەو ڕۆژە دەســـووتێم، کە ئیدی بە زمانی پەپوولە دەدوێین، بە چاوی شەونم تەماشا دەکەین، بە لێوی گوڵ پێدەکەنین، بە دڵی بەفر ئەوینداری دەکەین!

من دەزانم بۆ گەیشـــتن بەو دەفەرە، دەبێ قوربانی زۆر بدەم، من گوڵســـتانم دەوێ، بەڵام وەك مەولانای ڕۆمی دەڵێ: گوڵ لەســـەر بەرد ناڕوێ، ببە بە خۆڵ، دەبیتە گوڵستان!

ببە بە خۆڵ، تا بگەیتە ژێر پێی، تا بگەیتە ئەو مەقامە بەرزە

غولامانــه ســەرم دانــا لــه بەرپێیا، وەکــو زوڵفی
کەچی ئەو هەر منی خستۆتە پشتگوێ، وەك غولامانە! «مەحوی»

گلەیــی ناکــەم، خۆ هەموو کــەس ناتوانێ بگاتە دیوانی شــازادەی مەملەکەتی ئەوین!

خۆ هەموو خۆڵێك بۆ خاکی بەرپێی شایان نییە! دەبێ چاوەڕوانی ئەو ڕۆژە بکەین، خاکی ئێمە دەبێتە جێ نەقشی قەدەمی یار!!

خــۆت دەزانــی مووددەتێکە ســەیرو پامەڵی جەفام
کەی وەکو نەقشــی قەدەم، لەسەر نێمە ژێر پێتەوە «وەفایی»

ئەو دەڤەری گوڵســتانە، دڵی پاكو ســینەی چــاكو چاوی بە ئاوی عیشق شۆراوی دەوێ، مەستی بە هەستو شەمی سووتاوی دەوێ!

دەلیلی چاكو پاکی پێ دەوێ، وەســڵی ڕوخو زوڵفی
خودا شادی بە شانەی داو، سەفای جەننەت بە ئاوێنە «وەفایی»

هەمیشە دەمەوێ ببمە شایانی ئەوەی بتوانم بێمە حزوورت، بتوانم ئەو ڕێگایە بگرم، کە دەمگەیەنێ بە تۆ، بە بێدەنگی، ئازارەکان بنۆشم....!

گوێ لە قســەی کەس ناگرم، کەس نە منو نە ڕێگاو نە مەتڵەبی عومرم نابینێ! جگە لە سۆمای چاوی عاشق هیچ چاوێك جوانی نابینێ! هیچ چاوێك بە حەقیقەت ئاشــنا نابێ! باســی ســووتانی نیوەشەوو، سەودای عومرو بەخشینی ڕۆح، بۆ کێ بکەم؟!

بە تاری زوڵفو گوڵناری جەمالی تۆ بە ڕۆژو شــەو
سەرم دەربەندی سەودایە، دڵم سەر گەرمی سووتانە «وەفایی»

کێ دەزانێ من بۆ دەســووتێمو بۆ کاتێ لە گوڵشــەنی موحتەرەمت

نزيك دەبمەوە گڕی هەناوم خەریکە دەمکا بە قەقنەس!

وانەی سووتانو گڕی ناخو قرچەی دڵ بۆکێ ئەدا بکەم!

مەنعی ســووتانم دەکا ئەبمە، لە شــەوقی تەلعەتت

چۆن ئەســووتێ ئاتەشی سوزان، کە گەییە نەوتەوە «ئەدەب»

بۆ گەیشتن بە تۆ، هەموو دنیام وەلاناوە، نەبیر لە هیچ دەکەمەوەو نە دەمەوێت لە بیری کەسدابم!

دەزانم، گەیشــتن بــە تۆ، ڕێگایەکی درێژی دڕکڕێژی پڕمەترســیو پڕئاستەنگو شاخو داخو ئاخو ئاهـ و زۆرانبازی لەگەڵ مەرگە!

بــەلام ئەو کاتەی ئەوینــدار، هیچ نابینێ جگە لە ڕێگایەك، کە بە ئەوینداری دەگەیەنێ!

هەست بە ئازارێ ناکا، جگە لە ئازاری دووری، گوێ لە هیچ ناگرێ، جگە لە ئاوازی قافڵەی ئەوین! ڕازو نیازی خۆی بۆ کەس عەرز ناکا جگە لە ئەویندار! مەستی لیقایەکە، کە دەزانێ چی ڕوودەدا، گەر بێتو یاری دەرکەوێ جارێ!

هەناســەم دا بە ناڵە، عەرزی حاڵی کەم، کە تاساوە

لە خوێناوی دڵو جەرگم دەروونم کەیلە تا ســینە

لە عالەمدا، عەلامەی سوبحی حەشر، ئیمشەو بەیانی دا

خودا عالم، لە چاکی ئەو بەرۆکە، دەردەخا ســینە «مەحوی»

ئازیزم، بیزاعەم موزجاتە، وەك کوڕانی یاقوب، چیم هەیە تا قابیلی دیوانی یوسفینت بێ؟!

ئەگەر ســەد ڕۆحو دڵ بێنم، مورادی من ڕەوا نابێ

لەبــی لەعلی بە من نادا، دەزانێ ڕۆح، چ شــیرینە «وەفایی»

لە کازیوەیەکی نۆبەرەی بەهارێکی نوێدا، هەنگاوم دەنا بۆ حزوورت، قۆناغم دەبڕی بۆ دیدارت، دەزانم ئێستا هەنگاوەکانم، بە ترپەی دڵت دەژمێری، نەك بە چرکەژمێری کاتژمێرەکەت، وەك چۆن من، بە بۆنی میسکی هەناسەت، دەزانم شازادەکەم بەرەو دەڤەری ڕۆحم هەنگاو دەنێ!

ئازیزم، من نەهاتووم شتێکی نوێت بدەمێ، من تەنها بۆ ئەوە هاتووم، بە جوانییەکانی خۆت ئاشنات بکەم، جوانییەك، کە پێشتر نەتدەزانی لە تۆدا هەن، کەسیش نەیدەزانی، تا پێت بڵێ!

بە دیدارت، ئەگەر تارێ لە زوڵفت
بە موڵکی "کەی" بدەم، یا تەختی "دارا"

-ئەدەب-

خۆ منیش، وەها بە ئاسانی، نەگەیشتمە ئاستێك، تا بتوانم شەرحی ڕموزی جوانیت بکەم، تەلیسمی سیحری جەمالت بدۆزمەوە! بتوانم لە وەسفی ڕوخسارێکا بنووسم، کە وەکو تاهیر بەگ دەڵێ:

فەلەك زانی، کە دەشکێ؛ ڕەونەقی بازاڕی مانگو خۆر
شکاندی پەنجەکەم، تا من نەنووسم وەسفی ڕوخساری

ڕوخسارو پەرچەمێك، کە وەکو ئەدەب دەڵێ:

ڕوومەتت بەدری مونیرو
پەرچەمت وەك میشکی ناب
لەو خەجڵ ما ئافتابو لەم شکا، قەدری گوڵاب

جەماڵێك، کە "نالی" بڵێ لە وەسفیدا:

شکافێکە کڵافەی نافی زوڵفت

دەرێـــــژیٚ مـــیـــسـكو عــەنــبــەر، لــێــرە تـاچـیـن
لـــەســـەر بـــەرگـــی گــوڵــێـكـی بـــاغـــی حـوسـنـت
هـــــەزار، گــوڵـچـیـنـی بـێــبــەرگو نــەوا،چــیــن
ئــەتــۆ مــیــهــریو مـــەهـــرِوویــــان ســـتــارەن
لــە خــزمــەت شــەوقـی تـــۆدا، شــەوچــرا چـیـن؟!
من هاتووم؛ فێربم، قوتابیبم، نەك مامۆستا.. موریدبم، نەك شێخ.. شاگردبم نەك حەكیم!
هەرگیز وا نەزانی هاتووم، تا بتكەم بەخۆم، نا.. هەرگیز..... شتی وا چۆن دەبیٚ؟!
هاتووم؛ ببم بە خۆڵ، تا بگەم بە تۆ.. هەموو تەمەنم بدەم، تا لە دەریای حوسنی تۆدا، بەهرەمەند بم!
حیكمەتی پڕ مەسئەلەی كوڵمت، لە بۆ كیٚ حەل دەبیٚ
هــەر سـەحـیـفـە، ســەد ئـیـشـارەو ڕەمــزی تـێـدا جارییـە
خـاڵـی ڕوخـــسـارت، هـیـدایـەتـبـەخـشـە، شـەرحـی زوڵـفـەكـەت
قـــازی ئـــاســـا، حــاشـیـیـەی ئـەگـریـجـەكـانـت لارییـە
ڕووت وەكـو ئـاتـەش، مـوژەت وەك شیشە، ئـەبـرۆت قیمەكێش
مـیـروەحـەت زوڵـــفو كـەبـابـت، جـەرگـی پـارەی "نـاری"یـە
هەرچەندە ئازیزم، خۆشەویستی نابینریٚ، ناخوێنریٚ، ناتوانین بیكڕین، ناتوانین فێری بین، ئەوە نیعمەتێكی خوداییە، فەیزێكی ئیلاهییە، خوداوەند دەیخاتە نێو دڵەكان، بە لوتفی خۆی، ڕۆحەكان بە یەكتر ئاشنا دەكا، دڵەكان لە یەكدا دەتوێنێتەوە! نوورێك بە دڵەكان دەبەخشیٚ، كە ئیدی، هەرگیز ڕێگا ون ناكەن!!

ئاسودەییەك دەدۆزنەوە، كە ئیدی، هەرگیز ناتوانن دەستی لێ هەڵبگرن!!
منیش بۆ ئەوە هاتمە حزوورت، تا لە جیهانێكدا بژیم، كە هەموو كەس لەوێدا، تاجی پاشایەتی لەسەر دەكەن! ئیدی باسێك، لە دونیاو ماددەپەرستی نامێنێ، لەوێدا ئیدی، پێویستت بە كەس‌و بە هیچ نییە! بیر لە هیچ ناكەیتەوە! نیگایەك هەموو مەتاعی دونیات، لە بیر دەباتەوە!
هاتم؛ تا لەسەر ئەژنۆ، لە خزمەتتدا، وانەی ئەوین بخوێنم، چ فەزڵێكی گەورەیە؛ گەیشتن بە دیداری ئوستادی دڵ! من ئەمەم بە خەو، بە ئاوات دەخواست!

شەوێ لەیلا بە مەجنونی، وەها وادەی تەماشا دا
دەبێ ڕۆژێ ببینی من، كە تۆ ڕێخەیتە ، دەشتی خەو
مەحوی

هاتم؛ تا چیدی، دڵم لە سەحرای تەنیاییدا، لە سەرما هەڵنەلەرزێ! هاتم؛ تا چیدی سۆمای چاوم، لە چاوەڕوانیدا نەتوێتەوە! هاتم؛ تا چیدی دەستەكانم، نەبن بە تەوقی ئەژنۆم! هاتم؛ بۆئەوەی نەمرم، هەناسە بدەم، بژیم.... ڕاستتر بڵێم.. هاتم؛ تا جارێكی دی، لەدایك ببمەوەو تامی ژیانی ڕاستەقینە بكەم!!

گەر دزێو بێ؛ دیمەنی ژینگە، ئەوین جوانی دەكا
خۆشەویستی، سەد برینت لێ بێ، دەرمانی دەكا
دەردو ژانە ژین، ئەگەر هیوایەكی تێدا نەبێ
گەر قەڵای دڵ ساردوسڕ بێ، ڕوو لە وێرانی دەكا-هێدی-

ئەو كاتەی باسی ئەوینی تۆ دەكەم، هەموو دنیا بۆنی تۆ دەگرێ،

دڵۆپێك لەو گوڵاوە بەسە بۆ گوڵاوپرژێنی هەموو دنیا، ئەوە عەبیری بەهەشتە، میسك و ڕێحانی فیردەوسە، من بەو عەبیرە خۆم شۆری، پاك بوومەوە، بەرزبوومەوە بۆ كەشكەشانی فەلەك، تەنها ئەوینی تۆ توانی من بشواتەوە، لە هەموو گوناهێك پاكم كاتەوە، هیچ مامۆستایەك نەیتوانی هێندەی چاوەكانت فێرم بكا، من قوتابی چاوەكانی تۆم، بۆیە كە دێمە حوزروت حەز ئەكەم تەنها تەماشای نێوچاوانت كەم، بۆم كرابا نەمدەهێشت پێڵوی چاوەكانت لێك بنێیت! تۆ بوویت سەرابت بۆ كردم بە دەریا، خەیاڵت بۆ كردم بە حەقیقەت!

ژیانت كردم بە خەونو خەونت بۆ كردم بە ژیان! تۆ بوویت بێ وشە، لەگەڵم دوایت، بێ دەرگا هاتیتە ژووری دڵم!

پێش ئـەوەی تەشریف بهێنیت، هەموو شوێنەكان تاریكبوون! هەموو تەمەن بە هەدەر دەگوزەرا! هەموو هیواكان زەردو ژاكاوبوون! لە ژێر هـەزاران پەڕەی كتێبدا بۆ تۆ دەگـەڕام... چاوەڕوانی كەسێك بووم بێت، دەست بكا بە گیرفانی دڵما! ببێتە شازادەی مەملەكەتەكەم، ئیمپراتۆری دڵم، ببێتە مێژووم، ئەمرۆم، ئایندەم!

ئەدی چۆن هەموو عومرم ئاواتی دیداری تۆو حوزوری بەردەرگی شاهانەی تۆ نەبێ..

وإنّي لأهوَى النَّوْمَ فـي غَيْـرِ حِينـهِ،
لَعَلَّ لِقَاءً في المَنَامِ يَكُونُ -قیس لبنى-

حەزدەكەم بە خەو، با كاتی خەویش نەبێ، بەڵكو دیداری تۆم لە نێو خەودا دەست كەوێ! بەڵام خەو كوا؟ وەكو مەحوی دەڵێ:

خـەو دەزانـێ نییـە، دەیـوت: دەبـنـوو بێـمە خـەوت نـێك بـەخـتـم بـە وەنـەوزێ بكـە، ئـەی بـەخـتـە مـەدەد